بەشێک لە پەیامەکانی نوور

# یەکەم دەروازەی نوور



بەدیعوززەمان
سەعیدی نوورسی
دایناوە

فاڕووق ڕەسووڵ یەحیا
کردوویە بە کوردی

**ئەم پەیامە:**
* مامۆستا (**بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی**) بە زمانی عەرەبی دایناوە.
* (**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**) کردوویە بە کوردی.
* مامۆستا (**حسەین حەسەن کەریم**) لەگەڵ دەقی عەرەبییەکەدا بەرامبەری کردووە.
* چاپی یەکەم: سلێمانی ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز.
* (**ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا**) نەخشەی بەرگی کێشاوە و بڵاوی دەکاتەوە.

* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٧٤)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

بەشێك لە پەیامەکانی نوور

# یەکەم دەروازەی نوور

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

## وتەی وەرگێڕ

# ئەم پەیامە

لە گەشتی دوورخستنەوەی مامۆستا نوورسیدا، لە شاری "وان"ەوە بۆ مەڵبەندی ناحییەی "بارلا" (ساڵی١٩٢٦-١٩٢٧ز)، جگە لەو گوند و شارانەی کە دەکەوتنە سەر ڕێی ئەو گەشتە درێژخایەنە و چەند ڕۆژێك بۆ وچان تیایدا دەمانەوە، پاشماوەی کاتەکانی نێوان ئەو دوو شوێنەی لە چەند شارێك بەسەر برد، لەوانە: ئەستەمبووڵ، بوردوور، ئیسپارتە. زۆرترینی ئەو ماوەیەش لە شاری "بوردوور" مایەوە کە حەوت مانگی خایاند.

یەکێك لە کارە دیارەکانی لەو ماوەیەدا دانانی ئەم پەیامە بوو بە زمانی تورکی بە ناوی "نورك إلك قپوسی Nur'un İlk Kapısı" واتە (یەکەمین دەروازەی نوور) کە وەك نۆبەرەی پەیامەکانی نوور وایە.

پەیامەکە لە بناغەدا لە (سیازدە وانە)ی کورت و پوخت پێکدێت و، دوایی چواردەهەمینیشی بۆ زیاد کردووە.

خوێنەری شارەزای پەیامەکان لە دەمی خوێندنەوەی ئەم پەیامەدا سەرنج دەدات و، دانەر خۆیشی لە پێشەکییەکەیدا باسی کردووە، کە وانەکانی ئێرە لە چەند شوێنێکی دیکەی پەیامەکاندا بە شێوەیەکی پوختتر یان درێژتر هێنراونەتەوە. جا ئایا کامیان لە پێشتر نووسراون و، شوێنەکانی ئەم وانانەی ئێرەش لە پەیامەکانی تردا کامانەن؟

هەوڵ دەدین وەڵامی ئەم پرسیارە لەم دێڕانەی خوارەوەدا بخەینە پێش چاوی خوێنەری ئازیز:

لە کۆی وانەکانی ئەم پەیامەدا تەنها دووانیان (یازدەهەم و دوازدەهەم) لە پێش دانانی ئەم پەیامە تورکییەدا بە زمانی عەرەبی نووسراون، ئەوەش لە پەیامی

(زَهرةٌ من رياضِ القرآنِ الحكيم) واتە (گوڵێك لە باخچەی قورئانی حەكـیم)دا كە ساڵی (١٩٢٣ز) لە ئەستەمبووڵ چاپكراوە و بڵاوكراوەتەوە.

دوازدە وانەكەی تر لە پێش ئەم پەیامەدا نەنووسراون و، بەم جۆرەن:

وانەكـانی (یەكەم و سـیازدەهەم) كە دانەر لەم پەیـامەدا بە زمـانی تـوركی دایناون، دواتر لە "بارلا" بە زمـانی عەرەبی لە پەیـامی "نوورێـك لە نوورەكـانی ئەستێرەكانی قورئان"دا داڕشتوونەتەوە، كە پەیامێكە هەتا دانەر لە ژیاندا بـوو نە بە چاپ و نە بە دەستنووس بڵاونەكـراوەتەوە و، دوای وەفـاتی لە نێـو كـۆمەڵە پەیامی "مەسنەویی نووری"دا جێی بۆ كراوەتەوە.

بەڵام وانەكانی (دووهەم تا دەهەم)، دانەر دوای دانانی ئەم پەیـامە تـوركییە، لە نێو باسەكانی بەشی سێهەمی "بۆنێك لە سروەی ڕێنماییەكـانی قورئـان"دا بە زمانی عەرەبی داڕشتووەتەوە، كە بەشێكە لەو پەیامە و پێشتر بڵاونەكـراوەتەوە، چـونكە چـاپی یەكەمـی پەیـامی عەرەبیـی نـاوبراو كە لە سـاڵی (١٩٢٢ز)دا بڵاوكرایەوە، تەنهـا بەشی یەكەمـی پەیـامەكە بـوو، بەڵام بەشـەكانی دووهەم و سێهەمی دواتر بە زمانی عەرەبی لە تاراوگەی بارلا داناوە.

وانەی (چـواردەهەم)یش، لە ڕاسـتیدا بـریتییە لە هەردوو پەیـامی "چەنـد بریسكەیەك لە خۆری تەوحید" و "چەند نمێك"، كە دوو پەیامی سەربەخۆن لە نێـو كـۆمەڵە پەیـامی "مەسـنەویی نـووری"دا و، یەكەم جـار بە یەك پەیـام بڵاوكـراونەتەوە و، لە نووسـینەكانی "سـەعیدی نـوێ"ن لە بـارلا دوای سـاڵی (١٩٢٧ز).

ئێمە لەم وەرگێڕانە كـوردییەدا، كـۆی وانەكـانی (یەكەم تـا سـیازدەهەم)مان هێناوە، بەڵام دەسبەرداری وانەی چواردەهەم بـووین، لەبەر ئەوەی لە لایەكەوە لەچاو وانەكانی دیكەدا دوور و درێـژە؛ هەروەك كتێـبەكەی پـێ گەورە دەبێـت لەوانەشە ئەو خوێنەرەی كە لەسەر ڕەوتی كورتی وانەكانی پێشـوو ڕاهـاتووە لە دوور و درێژیـی ئەو وانەیە بێـزار ببێـت.. لە لایەكی دیكەشـەوە خـوێنەری

خۆشەویست هەر کاتێ مەبەستی بێت دەتوانێت لە کتێبی "مەسنەویی نووری"دا بیخوێنێتەوە.

مامۆستای دانەر لە دەمی دانانی پەیامە تورکییەکاندا لە "بارلا"، وانەکانی ئێرەی بە شێوەیەکی فراواتر لە شوێنی پێویستی ئەو پەیامانەدا دارشتووەتەوە.

ئێمە لە پەراوێزی سەرەتای هەموو وانەیەکی ئەم وەرگێڕانە کوردییەدا پوختەیەك زانیاریمان لەسەر شوێنی ناوەرۆکی وانەکە، چ لە "مەسنەویی نووری" و چ لە پەیامە تورکییەکاندا نووسیوە، تاکو خوێنەری بەڕێز بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنانەی تر لە پەیامەکاندا و، بتوانێت بە کۆی دەقە جیاجیاکانی ئەو باسە تێگەیشتنی تێروتەسەل لە بابەتەکە بەدەست بهێنێت.

هەروەك سەرنجمان دا کە لە پاشکۆی چاپی کتێبە تورکییەکەدا چەند پارچە شیعرێکی قوتابیانی مامۆستا نوورسی و، هەندێ شایەتیی فەیلەسووف و زانایانی خۆرئاوا سەبارەت بە گەورەیی قورئان، دانراوە..

لەبەر ئەوەی هیچ کام لەوانە بەشێك نین لەم پەیامە و، بەرهەمی دانەری ئەم کتێبە نین، ئێمە لەم وەرگێڕانە کوردییەدا فەرامۆشمان کردن.

هەموو ئەمانەی کە لە سەرەوەدا باس کران، سەبارەت بە ڕووی ڕواڵەتی پەیامەکەن..

ناوەرۆکەکەشی، وەکو ناوەرۆکی هەموو پەیامە عەرەبییەکانی "مەسنەویی نووری"، حاڵەتە قەلبی و ڕۆحییەکانی دانەر دەنوێنن لە دەمی گۆڕانیدا لە قۆناغی "سەعیدی کۆن"ەوە بۆ قۆناغی "سەعیدی نوێ".

دانەر لە وەسفی وانەکانی ئەم پەیامەدا دەڵێ:

(لە دەرەنجامی مونازەرەی نێوان سەعیدی کۆن و نوێدا نووسراون و، دەروونی بەدخوازی مرۆڤ بێدەنگ دەکەن و، ڕاستییەکانیش تا "پلەی شهوود" لەخۆدەگرن و، ڕاستەوخۆ لە موعجیزاتی ڕەوانبێژیی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە، تا ڕادەی "عین الیقین" بوونەتە وانەیەك بۆ "سەعید". هەروەك بینیم

کەسی ئاراستەبۆکراوی گوفتار لە هەموو یەکێکی ئەم وانانەدا ڕاستەوخۆ سەعیدە..)!

هەر توێژەرێکی بەڕێز بیەوێت لەو ئاڵوگۆڕە تێبگات کە بەسەر دانەردا هاتووە لە دەمی پەڕینەوەی لە نێوان هەردوو قۆناغەکەی ژیانیدا، پێویستی بە دیراسەکردنی وردی "مەسنەویی نووری" دەبێت، بە تایبەتی خوێندنەوەی ئەم وانانە، چونکە لەو بەرهەمانەن کە دەتوانن موعاناتی دانەر لە بەرزەخی نێوان ئەو دوو قۆناغەدا دەربخەن.

بەسەرهاتی ژیانی هەموو یەکێك لە "ئیماندارانی پێشەنگ" دەریدەخات کە لە گەشتی یەکلاکردنەوەی "بەندەیی"یاندا بۆ بەدیهێنەر، بە چەندین موعاناتی دژواردا تێدەپەڕن و، لەگەڵ خۆیاندا گەلێ ماندوو دەبن، هەتا ئەو کاتەی کە پەردەکان لادەدەن و بینایی دڵیان بەسەر دیمەنی ڕاستییە مەزنەکاندا واڵا دەکەن!

لە ڕاستیدا ئەم پەیامە چەند وانەیەکە لە یەکەمین هەنگاوەکانی دانەر لەو گەشتە ناوازە و ئازایانە و پڕ لە چێژەدا. هەروەك سەرمەشقێکیشە بۆ ئەو کەسە خواپێداوانەی کە شەرەفمەندی گەشتی لەو جۆرە دەبن..

لە پەروەردگاری بەخشندەمان دەپاڕێینەوە کە بە چاکە و میهرەبانیی فراوانی خۆی، ئێمەش لەگەڵ خوێنەری بەڕێزدا بخاتە ڕیزی گەشتیارانی ئەو ڕێیە.

وَصَلّىٰ اللّٰهُ وَسَلَّمَ عَلىٰ سيِّدِنا ونَبِيِّنا مُحَمَّدٍ وَعَلىٰ آلِه وَصَحْبِه أجمَعين.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

* * *



## بِاسْمِهِ سُبْحَانَـهُ

ڕووداوێـکی نـوورانیی سـەیری ئەوتۆتـان بـۆ بـاس دەکەم کە تـووشی سەرسووڕمانێکی زۆری کردووم:

پـاش دابـڕانی بیسـت و پێـنج سـاڵم لە یەکەمـین مەدرەسـە و کـێڵگەی پەیامەکانی نـوور، کە "گونـدی بـارلا"یە، بە سـیلەیەکی ڕەحمـی زۆر زیـاتر لە تامەزرۆییم بۆ گوندەکەی خۆم (گوندی نوورس) هاتم بۆ بارلا.. بینیم کە:

هەسـت بە حـاڵەتێکی دەگـمەنی پەژارە و چێـژێکی وەکـو ئەوە دەکەم کە هاتبمەوە بۆ قوتابخانەکەم لە گونـدی نـوورس و، مـاڵی بـاوکم لە نـوورس و، گوندەکەی خۆم گوندی نوورس! یەکسەر ڕوانـیمە نـاخی گیـانم و، بە نیـازی بینین و زانیاری، بەناو هەمـوو ئەو شـوێنانەدا گەڕام کە جێـی شـێوازی ژیـانی سـەعیدی کـۆن و نـوێ و، شـوێنی جموجووڵەکـانی لە ڕێـی گەیشـتندا بە حەقیقەت و، بنکە وقوتابخانەی دانانی پەیامەکانی نوور بوون..

پاشان کە من لە حاڵەتێکی ئاوا خۆش و پڕ لە جۆش و خرۆشدا بووم، کاك "سلێمانی ڕاستگۆ"، کە بـۆ مـاوەی هەشـت سـاڵ بە بـێ وەسـتان و بەوپەڕی جوانی و دڵسۆزی لەوێ خزمەتی کردم، هات و کتێبێکی (خۆمی) بۆ هێنام.

کە کـردمەوە، بینـیم سـیازدە وانەیە، کە لە دەرەنجـامی مونـازەرەی نێـوان سـەعیدی کـۆن و نوێـدا نـووسراون و، دەروونی بەدخـوازی مـرۆڤ بێـدەنگ دەکەن و، ڕاسـتییەکانیش تـا "پـلەی شـهوود" لەخـۆدەگرن و، ڕاسـتەوخۆ لە موعجیزاتی ڕەوانبێژیی ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆزەوە تـا ڕادەی "عـین الیقـین"

بوونەتە وانەیەك بۆ "سەعید". هەروەك بینیم کەسی ئاراستەبۆکراوی گوفتار لە هەموو یەکێکی ئەم وانانەدا ڕاستەوخۆ سەعیدە..

هەروەها تۆو و ڕوونکردنەوەی تەواوەتیی هەندێك لە وتە بچووکەکان و چەند وتەیەکی گرنگی ترم لە نێویاندا بینی، بە تایبەتی پارچەی پێش کۆتایی ئەم پەیامە (وتەی نۆزدەهەم) کە تایبەتە بە ڕیسالەتی ئەحمەدییەوە ﷺ و سەرەڕای بچووکیی وتەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر گەورە و بەپێزە هێنراوەتە ناو ئەم پەیامەوە کە لە حوکمی تۆوێکدایە. کەواتە ئەو وتەیە، لەبەر گرنگییە زۆرەکەی، بە تەواوەتی هاتووەتە ناو ئەم تۆوەی نوورەوە و، چەند جارەش لەنێو کۆمەڵە پەیامەکانی نووردا بڵاوکراوەتەوە.

من ئەم پەیامە زۆر گرنگەم لە بیرچووبووەوە و لە یادم نەمابوو. وا ئێستا بە یادگارییەکی خزمەتی ڕاستگۆیانەی هەشت ساڵەی "سلێمانی ڕاستگۆ" و، وەك خزمەتێکی زۆر گەورەی ئەو قبووڵم کرد و، وتم: "هەزار جار بارَكَ اللّٰه".

هەرچەندە ڕاستییەکانی نێو ئەم پەیامەی کە لە حوکمی پێڕست و لیست و تۆوێکی پەیامەکانی نووردایە، لە وتە بچووکەکان و وتەکانی تردا تا ڕادەیەك نووسراون؛ بەڵام چونکە یەکەم وانەی قورئانی پیرۆزە بۆ سەعید و، وەکو جۆرێك لە مەشهووداتی ئەوە لە پلە تەواوەتییەکانی "علم اليقين" و "عين اليقين"دا و، بە چاوپۆشیکردن لە کەم و کورتیی دووبارەبوونەوەکانی ناوی، کە دەرەنجامی نەشارەزاییمە لە دانان و نووسیندا، با قوتابیانی نوور بڵاوی بکەنەوە، بە ویستی خوای گەورە کەسانێکی زۆر سوودی لێ دەبینن[١].

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(١) ئەم پێشەکییە، ئەحمەدی کورم لە تورکییەوە وەریگێڕاوە. (وەرگێڕ)

# وانەی یەکەم[1]

﴿إِنَّ اللَّـهَ اشْتَرَىٰ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ (التوبة: ١١١).

ئەی مرۆڤ! بزانە کە:

﴿مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ﴾؟! (الإنفطار: ٦)..

چی تۆی یاخی کردووە بەرامبەر بەو پەروەردگارە بەخشندەیەت کە ئەو موڵکە ئەمانەتەی خۆی (کە لای تۆ دایناوە) دەیکڕێتەوە لێت، تاکو:

بیپارێزێت بۆت لە تیاچوون و..

بۆ ئەوەش بەهاکەی یەك بۆ هەزاران بەرز ببێتەوە و..

لە بەرامبەریەوە نرخێکی گەورەت پێ دەدات و..

جارێ بۆ سوودی تۆ لە دەستی خۆتدا دەیهێڵێتەوە و..

لە بریی تۆیش ئەرکی سەرپەرشتیکردنی دەگرێتە ئەستۆ.

کە ئەمەش قازانجی ناو قازانجی ناو قازانجی ناو قازانجە!

کەچی تۆی بێئاگایش پێی نافرۆشیت. بەم نەفرۆشتنە:

ناپاکی لە ئەمانەتەکەی ئەو دەکەیت و..

نرخەکەی لە ئاسمانەوە بۆ ڕێسمان دادەبەزێنیت و..

---

(١) دانەر وانەی یەکەمی بەم شێوەیەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٧١٧-٧١٩) داڕشتووەتەوە. بە فراوانتریش لە "وتەی شەشەم"دا ڕوونی کردووەتەوە. بڕوانە: (وتەکان) ل: ٢٤-٣٠؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٤٩-٥٨. (وەرگێڕ)

پاشان بە بێ سوود تیادەچێ و..

ئەو نرخە گەورەیە لە کیسی خۆت دەدەیت و..

ئنجا ئەرکی سەرپەرشتیکردنی و، گوناهەکانی دەکەونە ئەستۆی خۆت و، کۆڵی پاراستن و ئازارەکانیشی سەرشانت قورس دەکەن..

ئەمەش زیانی ناو زیانی ناو زیانی ناو زیانی ناو زیانە!

تۆ لەم مامەڵەیەدا بە وێنەی پیاوێکی هەژاریت لەسەر چیایەك. ئەو چیایە بوومەلەرزە لێی دابێت، ئیتر هەموو هاوشێوەکانی ئەو پیاوە لەوێوە بەربووبنەوە خوارەوە بۆ ناو بنکی شیوەکان و هەر شتێکیان لە دەستدا بووە وردوخاش بووبێت. ئەویش ئەم حاڵە دەبینێت و خۆیشی لەسەر لێواری کەندەڵانێکی داتەپیو خەریك بێت بەرەو تیاچوون بەربێتەوە. ئەوەش کە لە دەستیدایە مەکینەیەکی ڕازاوەی سەرسوورهێنەر و ئەمانەت بێت لە لای، چەندین ئامێری زۆر و زەبەندە و سوودی لە ڕادەبەدەر و بەرهەمی ناکۆتا لەو مەکینەیەدا هەبێت. خاوەنی مەکینەکە، لە ڕووی سۆز و میهرەبانییەوە، پێی بڵێت:

دەمەوێ ماڵ و سامانەکەم کە لە دەستی تۆدایە - وەك ئەوەی کە هی خۆت بێت - لێت بکڕمەوە، تاکو لەگەڵ کەوتنەخوارەوەی تۆدا ئەویش نەشکێت و زایە نەبێت. بەم جۆرە خۆم پارێزگاریی لێ دەکەم و بۆت هەڵدەگرم تا ئەو کاتەی لە شیوەکە دێیتە دەرەوە. ئیتر بە بەردەوامی دەمێنێتەوە و ناشکێ. هەروەها بۆ ئەوەی ئامێر و تەرازووەکانی ئەو کارگەیە لە باخە فراوانەکانم و لە گەنجینە پڕ لە گەوهەرەکانمدا بخەیتەکار و، بەمەش بەهای زیاد ببێت. سەرجەم کرێ و بەرهەمەکانیشی بۆ خۆت وەربگریت..

دەنا بە وێنەی ئامێرێکی ئاسایی لێ دێت کە نرخی نەمابێت و، لە تەنگەبەرەکانی ورگ و دوو ئەشکەوتەکەتدا[1] بەکارهاتبێت. چونکە ورگ و

(١)دوو ئەشکەوتەکە(الغاران): دەم و عەیبی مرۆڤە. دەشڵێن: ورگ و عەیبیەتی. (وەرگێڕ)

ئارەزووەکانی تۆ لە کوێ و، باخ و بێستان و گەنجینەکانی خوای گەورە لە کوێ؟ دوو ئەشکەوتەکەت چۆن جێی خستنەگەڕی مەکینەیەکیان تێدا دەبێتەوە کە لە دنیادا جێی نابێتەوە؟

وا من لە بەرامبەر فرۆشتنەوەی ئەم مەکینەیەوە بە خۆم، نرخێکی گەورەت دەدەمێ و، هەتا لەم چیایەشدا بمێنیتەوە لێت وەرناگرم، بەڵکو دەسکەکەی لای سەرەوەی وەردەگرم تاکو هەڵگرتنی لەسەر شانی تۆ سووك بکەم و، ئەرکی پاراستنی دەستەوسانت نەکات.

جا ئەگەر پێتفرۆشتم و، بە ناوی خۆم و بە حسابی من هەڵسوکەوتت تێدا کرد، بە وێنەی ئەو سەربازەت لێ دێت کە ئەوەی لە دەستیدایە بە ناوی پادشا و بە حسابی ئەو کاری تێدا دەکات، بە بێ مەترسیی لە شتانی داهاتوو، یان خەم و پەژارەی بۆ ڕابوردوو.

بەڵام گەر ئەم فرۆشتنەت پێ قبووڵ نەبێت، کە لە پێنج ڕووەوە قازانجی تێدایە، ئەوا لە پێنج ڕووەوە زیان دەکەیت و، دەبیتە کەسێکی دەستپیس لە ئەمانەت و، بەرپرس دەبیت لە تیاچوونی.

خدای پر کرم خود ملك خودرا می خرد از تو

برای تو نگه دارد بهاء بی کران داده[1]

جا ئەو وانەیەی کە "قورئان" بە مرۆڤی دەڵێتەوە و فێری دەکات، بریتییە لە "فرۆشتن". پێی دەفەرموێت:

"بیفرۆشە، قازانج دەکەیت":

---

(١) بەیتە شیعرێکی فارسییە. بە واتای:

بەهایێ بێسنووری داوە ئەو خواوەندە بەخشندە

کە موڵکی خۆی لە تۆ دەکڕێتەوە و بۆتی دەپارێزێ

(وەرگێڕ)

﴿وَإِنَّ الدَّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَـوانُ﴾ (العنكبوت: ٦٤).

بەڵام ئەو وانەیەی کە "فەلسەفە"ی شارستانێتیی کافران دەیڵێتەوە، بە مرۆڤ دەڵێت: "خۆت خاوەن موڵك بە":

﴿إِنْ هِيَ إِلاّ حَياتُـنا الدُّنْيا﴾ (الأنعام: ٢٩).

دەفەرموو سەیری جیاوازیی نێوان "هودا"ی ڕووناکبوو، لەگەڵ "دەهاء"ی ساختەدا بکە، با بینایت لەدەست نەدەیت!

﴿وَمَنْ كانَ في هٰذِه أعْمَىٰ فَهُوَ في الآخِرةِ أعْمَىٰ وأضَلُّ سَبيلاً﴾ (الإسراء: ٧٢).

اللّٰهُـمَّ ﴿اهْـدِنا الصِّــراطَ الْمُسْـتَقيمَ ۞ صِراطَ الَّـذِيْنَ أنْعَمْـتَ عَلَـيْهِمْ غَـيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ ولا الضَّالِّينَ﴾ (الفاتحة: ٦-٧).

آمين.

* * *

# وانەی دووهەم[1]

﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ۞ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ﴾ (الشعراء: ٩٠-٩١)

ئەی بێئاگای وازهێنەر لە ئایین لەپێناوی وێڵبوون بە دوای دنیادا!

**بزانە کە:**

وا من چیرۆکێکی نموونەییت بۆ دەگێڕمەوە کە وێنەی بەشێکی ڕاستییەکانی دنیا و ئایینی تێدایە.

لە ڕابوردوودا دوو برا هەبوون، پێکەوە کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە دووڕییانێك، یەکێك لەو دوو ڕێیە ئەرکی جێبەجێکردنی یاسای تێدا بوو، ئەوی تریشیان وا دیار بوو هیچ ئەرکێکی تێدا نەبوو..

برا ڕەوشت جوانەکەیان، ڕێی دەستەڕاستی هەڵبژارد لەگەڵ ئەو ئەرکە سووکەڵەیەی کە تیایدا بوو. بەڵام برا ڕەوشت خراپەکەیان ئەوەی لای چەپی هەڵبژارد کە ڕێیەکی بە ڕواڵەت سووکەڵەی لە ناوەرۆکدا قورس بوو!

براکەی ڕێی دەستە چەپ، بە چۆڵاییەکی وشکدا ڕۆشت هەتا گەیشتە بیابانێکی چۆڵ. کتوپڕ دەنگێکی گەورەی بیست، بینیی شێرێکی ترسناکە هەڵمەتی بۆ دەهێنێت. یەکسەر هەڵهات هەتا گەیشتە لای بیرێك کە شەست گەز قووڵ بوو. لە تاوا خۆی هاویشتە ناو بیرەکە و هەتا ماوەی سی گەزی

---

(١) دانەر وانەی دووهەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٧٨-٥٨٢) داڕشتووەتەوە. بە فراوانتریش لە "وتەی هەشتەم"دا ڕوونکردنەوەی لەسەر داوە. بڕوانە: (وتەکان) ل: ٣٨-٤٧؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٦٩-٨٣. (وەرگێڕ)

بیرەكە بەربووە خوارەوە، لەوێ دەستی لە درەختێك گیر كرد كە لە دیواری بیرەكەدا ڕوا بوو. ئەو درەختە بە دوو ڕەگ ڕاگیر بوو بوو، دوو مشكی ڕەش و سپی خەریكی قرتاندنی ئەو دوو ڕەگە بوون! لەو كاتەدا سەیری لای خوارەوەی كرد، مارێكی گەورەی لەوێ بینی كە هەتا نزیكی قاچی ئەم سەری بەرز كردبووەوە و دەمیشی هێندەی دەمی بیرەكە واڵا كردبوو. لەم لاو ئەو لایشەوە بینیی كە چەندین مێرووی زیانەدری ئازاربەخش دەورانەوریان داوە. كە سەیری درەختەكەشی كرد، بینیی درەختی هەنجیرە، بەڵام لە بەروبوومە جۆراوجۆرەكانی درەختە جیاجیاكانی گرتووە..

جا لەو كاتەدا كە ژیری و هەستەكانی لە سامی ئەم بارودۆخە وەڕس بوویوون، كەچی خۆی لە ناڵەی دڵ و دەروونی خافڵاند و، گوێی لێ خەواندن و، خۆی وا لە خشتەبرد كە لەناو باخێكدا بێت..

جا بە پێی نهێنیی فەرموودەی (قودسیی) "أنا عندَ ظنِّ عبدي بي"[1] گومانی بەو جۆرە برد، بۆیە هەر بەو جۆرەش مامەڵەی لەگەڵ كرا. ئیتر بەردەوام لە نێوان ئەم دۆخە ترسناكەدا مایەوە كە لە نێوان ژیان و مردندا بوو.

ئەم هەژارە - بەهۆی تێگەیشتنی هەڵەی خۆی - پەیی بەوە نەبرد كە ئەم ڕووداوە مەتەڵ ئامێزانە ناگونجێ بە ڕێكەوت ڕوو بدەن.

دەبا ئێستا واز لەم بەدبەختە بهێنین لە سزای خۆیدا بێت و، بگەڕێینەوە، تاكو شوێنپێی برا پیرۆزەكەی ڕێی ڕاست هەڵبگرین.

ئەمەیان دڵشادە بە "گومانباشی"یەكەی خۆی، كە بەرهەمی ڕەوشت جوانییەتی.

بڕوانە چۆن بەهۆی ڕوانینی جوانیەوە سوودی لەو شتانە بینی كە براكەی سوودی لێ وەرنەگرتن..

---

(١) متفق عليه. (وەرگێڕ)

چـونکە بەدەم ڕۆشـتنەوە ڕێـی کەوتە بـاخێکی پـڕ لە گـوڵ و بەروبـووم، هەرچەندەش هەندێ شتی چەپەڵ و مردارەوەبووشی تێدا بـوو، بەڵام بۆخـۆی گەشت و گەڕانی بە ناو شتە جوانەکاندا کرد و، ئاوڕیشـی لە شـتە چەپەڵەکان نەدایەوە، وەك ئەوەی کە براکەی ئاوڕی لێ دانەوە.

پاشـان کەوتەڕێ هەتـا گەیشـتە بیابـانێکی چـۆڵ و، لەوێ دەنگـی شـێرە هێرشبەرەکەی بیست، ئەمیش ترسی لێ نیشت، بەڵام کەمـتر لە هـی بـراکەی، چونکە گریمانی ئەوەی دانا کە ئەو شێرە کارمەندێکی پادشای ئەو بیابانە بێـت. ئیتر هەڵهـات هەتـا گەیشـتە لای بیـرێکی شەسـت گەزی و، خـۆی هاویشـتە ناوی. لە ناوەڕاستی بیـرەکەدا خـۆی بە درەختێـك گیرسـاندەوە کە دوو ڕەگـی هەبوون دوو مشك خەریکی قرتاندنیان بوون..

ئـــاوڕی دایەوە، شـــێرەکەی لە لای ســـەرەوە بینـــی.. کە ســـەیری لای خوارەوەشی کرد مـارێکی هێنـدە گەورەی دی کە دەمـی وەکـو دەمـی بیـرەکە وابوو، نزیکی دەکردەوە لە قاچی ئەم. لە ترساندا سەرسام ما، بەڵام بە چەنـدین پلەی کەمتر لە سەرسـامیی بـراکەی. چـونکە بەهـۆی گومـانجوانیی خـۆی و تێگەیشتنی لە هاوشێوەیی ئەم شتە سەیرانە، زانیی مەتەڵێك لە گۆڕێـدا هەیە و، هەموویان لە ژێر فەرمانی فەرمانڕەوایەکدان کە چاوی لێیەتی و تاقیی دەکاتەوە. ئیتر لەم ترسەوە، ناسینی ئەو کەسـە بـوو بە مەراقـی کە بەم جـۆرە خـۆیم پـێ دەناسـێنێت و، لە لایەن خـۆیەوە بەرەو ئامـانجێکم دەبـات. لەم مەراقەشـەوە خۆشەویستیی خاوەنی ئەو مەتەڵەی لە دڵدا پەیدا بوو..

ئنجا سەیری سەرچڵی درەختەکەی کرد، بینیی درەختـێکی هەنجیـرە، بەڵام چەندین بەروبوومی جۆراوجۆری گرتووە..

هەر کە ئەمەی بینی، بە تەواوی ترسەکەی لە لا ڕەویـیەوە و، دڵنیـا بـوو کە نهێنییەك لەم ڕووداوانەدا هەیە (ئەمی پێ تـاقی دەکـرێتەوە) چـونکە نـاگونجێ درەختی هەنجیر بەروبوومی درەختەکانی تر بگرێت..

کەواتە ئەمانە ئاماژەن بۆ جۆرەکانی ئەو خواردەمەنییانەی کە ئەو پادشا بەڕێزە بۆ میوانەکانی خۆی ئامادەی کردوون.

ئیتر لە خۆشویستنی ئەو پادشایەوە خولیای دۆزینەوەی کلیلی ئەو مەتەڵەی کەوتەسەر، بەو شێوەیەی کە خاوەنی مەتەڵەکە پێی ڕازی بێت. ئەوەبوو ئەو کلیلەی ئیلهام کرا..

ئەویش بانگی لە پادشا کرد و، وتی:

لەبەر تۆ وازم لە هەموو شتێك هێنا و، پشتم بە تۆ بەست!

یەکسەر دەرگای بیرەکە درزی تێکەوت و دەرگایەکی تێدا کرایەوە بەرەو چەند باخێکی پاك و خاوێن..

ئنجا سەرنجی دا "شێر" و "مار"ەکە بوون بە دوو خزمەتگوزار لە بەردەستیدا و، خولْکیان دەکرد بۆ چوونە ناو باخەکە!

ئێستا سەیری جیاوازیی حاڵی دوو براکە بکە:

ئەویان چاوەڕێی کەوتنە خوارەوەیە بۆ ناو دەمی مارەکە.. ئەمیان لە دەرگای باخێکی ڕووناکی پڕ لە گوڵزار و بەروبوومدا خولْکی چوونە ژوورەوە دەکرێت..

ئەویان ترس و سامێکی هێندە ئازاربەخشی لێ نیشتووە کە خەریکە لەتاوا ناخی دڵی هەپروون دەبێت.. ئەمیان لە دۆخێکدایە کە پەندی بە تام و چێژی لێ وەردەگرێت و، ترسەکەشی خۆشەویستی و ڕێز و ناسینی لێ دەچۆڕێت..

ئەویان لە ترسناکی و نائومێدی و هەتیویدایە.. ئەمیان لە بێخەمی و ئومێد و تاسەمەندیدایە..

ئەویان لە دۆخێکدایە کە بووە بە نیشانە بۆ هێرشی دوژمنە ترسناکەکان.. ئەمیان میوانێکە دڵی بە خزمەتگوزارانی خانەخوێکەی دەکرێتەوە..

ئەویان سزاکەی خۆی بە خواردنی ئەو میوە بەتامانە نزیك دەخاتەوە کە تەنیا ڕوخسەتی چەشتنیانی پێ دراوە، تاکو لە نموونەکانیان بکرێت، نەك لێیان بخوات، چونکە هەندێکیان ژەهراوین.. ئەمیان خواردنەکەی دوا دەخات و، چێژ لە چاوەڕوانیدا دەبینێت.

جا ئەگەر لە وردەکارییەکانی چیرۆکەکە تێگەیشتوویت، ئەوا فەرموو ڕووەکانی پراوپڕی چیرۆکەکە لەگەڵ ڕاستیی ژیاندا بزانە:

مەبەست لە دوو براکە: ڕۆحی ئیماندار و، کافرە.. دڵی مرۆڤی چاك و، فاسقە..

دوو ڕێگاکە: ڕێی قورئان و ئیمان، ڕێی سەرپێچی و بوغرابوونە..

بیابانەکە: دنیایە..

شێرەکە: مردنە..

بیرەکە: جەستە و ژیانە. ناوەندە تێکڕای تەمەنیش، شەست ساڵە.

درەختەکە: تەمەنە.

دوو مشکە سپی و ڕەشەکەش: ڕۆژ و شەون..

مارەکە: ئەو بەرزەخەیە کە دەرگاکەی "گۆڕ"ە..

مێرووە زیانبەخشەکان: گرفتەکانن.

بەروبوومەکان: نیعمەتەکانی دنیان، کە یادخەرەوەی بەروبوومە هاوشێوەکانی بەهەشتن.

(میوە) ژەهراوییەکانیشیان: حەرامەکانیانن.

مەتەڵەکەش: نهێنیی حیکمەتی "بەدیهێنان"ە.

کلیلەکەش، بریتییە لە:

﴿اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ (البقرە: ٢٥٥).

بەو واتایەی کە:

"خوایە گیان! تەنیا تۆ پەرستراوی منیت و، ئامانجیشم ڕەزامەندیی تۆیە".

هەروەها بریتییە لە: (لا إلَهَ إلاّ اللّه)..

گۆڕانی دەمی ئەو مـارە بە دەرگـای بـاخەکە: ئەوەیە کە "گـۆڕ" بـۆ ئەهـلی قورئان و ئیمان، دەرگایەکە بەرەو سۆز و میهرەبانیی خـوای گەورەی میهرەبـان لە ڕاڕەوی بەرەو بەهەشتەکاندا..

بەڵام بـۆ گومڕایـان و یـاخیبووان، دەرگـایەکە بەرەو چەنـدین تاریکسـتانی ترسناك و لەبیرچوونەوەدا، لە بەرزەخێکی وەك بەندیخانەیەك کە دەڵێـی دەمـی هەژدیهایە..

گۆڕانی شێرە دڕندەکەش بە ئەسـپێکی ملـکەچ و هـاودەم، لەبەر ئەوەیە کە "مردن" بۆ کەسی گومڕا، دابڕانێکی هەمیشەییە لە سـەرجەم خۆشەویسـتانی و، دەرکردنیەتی لە بەهەشتێکی درۆینەی دنیایی بۆ زیندانی تاکە کەسی نـاو گـۆڕ. بەڵام بۆ کەسێك ڕێی ڕاستی گـرتبێتەبەر، شـادبوونەوەیە بە خۆشەویسـتانی و، گەیشتنەوەیە بە نیشتمانەکانی و، دەربازبوونە لە بەندیخانەی دنیـا بەرەو بـاخی بەهەشـت بۆ وەرگرتنی پاداشـتی خزمەتەکـانی، لە لایەن چـاکە و بەخشـشـی چاکەبەخشی خاوەن منەتی دادوەری میهرەبانەوە.

جَلَّ جَلالُهُ، لا إلَهَ إلاّ هُو.

اللّٰهُمَّ اجْعَلْنا مِنْ أهْلِ السَّعادةِ والْقُرآنِ والإيمانِ. آمين.

* * *

# وانەی سێهەم[1]

﴿فَلا تَغُرَّنَّـكُمُ الْحَيوٰةُ الدُّنْيا ولا يَغُرَّنَّـكُمْ باللّٰهِ الْغَرُورُ﴾ (لقمان: ٣٣).

ئەی ئەو کەسەی موسڵمانان بەرەو ژیانی دنیـا بانـگ دەکـات کە گەمەیەکە لەناو خەوتن و کاری بێهوودەدا و، هانیان دەدات لە بازنەی ئەو شـتە پاکـانەی خوا بۆی حەڵاڵ کـردوون و سـەروزیادی خواسـتە موباحەکانیـانە، بـڕۆنەدەر بەرەو بازنەی ئەو شتە چەپەڵانەی کە خوا لێی حەرام کـردوون و، ژیانیـان لێـڵ دەکات و، ناچاریان دەکات واز لە هەندێ خواستی ئایینەکەیان بهێـنن، یـان بە تەواوی دەستبەرداری ئایینەکەیان ببن..

ئەی ئەو کەسە!

**بـزانە کە:** تـۆ لەم هەوڵەتـدا وەکـو مەسـتێك وایـت کە "شـێر"ی دڕنـدە و "ئەسپ"ی هاودەمی مرۆڤ لێك جیا نەکاتەوە و، بە یەك چاو سەیری ئـامرازی لەخاچـدان و ئەو پەتەی منـاڵانیش بکـات کە دیلانێـی پـێ دەکەن و، نەزانـێ برینی ئازاربەخش کامەیە و گوڵی خەمڕەوێنیش کامە؟

بەڵکو شێرەکە بە ئەسپ بزانێت و، خـاچەکەش بە پەتی یـاریی جـۆلانە و، ئازارە بەسـۆکەش بە گـوڵی سـوور تێبگـات، ئنجـا لەگەڵ ئەوەشـدا خـۆی بە ڕابەرێکی چاکساز دابنێت!

---

(١) دانەر وانەی سێهەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نـووری"دا ل: (٥٦٣-٥٦٨) داڕشتووەتەوە. لە "وتەی حەوتەم"یشدا بە شێوەیەکی فراوانتر نـاوەرۆکەکەی هێنـاوە. بـڕوانە: (وتەکان) ل: ٣١-٣٧؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٥٩-٦٨. (وەرگێڕ)

پاشان بڕوات بۆلای پیاوێك کە لە بارودۆخێکدا سەرسام مابێت، چونکە ئەو پیاوە شێرێکی سەرسوورهێنەری لەپشتەوە بێت کە هەموو کاتێك ئامادە بێت هێرشی بۆ ببات و، خاچێکیشی لە بەردەمدا چەقێنرابێت و، لە هەردوو تەنیشتیەوە زامی قووڵ دەمی کردبێتەوە و، لەتاو دمەڵێك وەڕس بووبێت کە لە جەستەی دەرهاتبێت..

ئنجا دوو چارەسەریشی بە دەستەوە بێت کە ئەگەر بەکاریان بهێنێت دوو برینەکە - بە ڕوخسەتی خوا - ببن بە دوو گوڵی سوور و، زمان و دڵیشی دوو نهێنییان تێدا بێت کە هەرکات بەکاریان بهێنێت - بە فەرمانی خوای گەورە - شێرەکەی بۆ ببێت بە ئەسپێك کە هەر هێندەی سواری ببێت یەکسەر بیباتە خزمەت سەروەرە بەخشندەکەی کە بۆ خانەی حەوانەوە بانگهێشت و میوانداریی دەکات و، پەتی جودایی و خاچەکەش کە لە درەختی نەمان و فەناوە شۆڕ بووەتەوە - بە سۆزی خوای گەورە - بگۆڕێت بە ئامێرێکی گەشتوگوزار و ڕۆشتن و تێپەڕبوون بەسەر دیمەنە بەخورەمە تازەبووەکان و ئاوێنە گەڕۆکە بگۆڕەکاندا، بە نیازی زیادکردنی چێژ لە نوێبوونەوەی دەرکەوتنەکانی جوانیی پەتی و بەردەوامی هەمیشە ئاشکرا و دیار، بە تێپەڕبوونی وەرز و چەرخ و ڕۆژگارەکان.. هەروەها بۆ زیادکردنی چێژ لە تازەبوونەوەی شێوەکانی نیعمەت و نیعمەتبەخشین، بە تێپەڕبوونی خەڵکان و ڕۆژگار و ساڵەکان..

پاشان ئەو کەسە مەستەی کە خۆیشی لە هەمان بارودۆخدایە، بەو پیاوە بڵێ:

واز لەو دوو نهێنییە بێنە و، دوو چارەسەرییەکەش فڕێ بدە و، وەرە با پێکەوە یاری و سەما بکەین و گۆرانی بڵێین!

ئەو پیاوەش پێی بڵێت:

من بۆ حــەز و ئارەزووەكـانم هێنـدەم سـەروزیادە كە پاراسـتنی ئەو دوو نهێنی و دوو چارەسەرە كارئاسانیی بۆ بكات و، ناگونجێ چێـژ و بەخـتەوەری لە شتێكی جگە لەوەدا هەبێت..

جا ئەگەر تۆ دەتوانیت شێری ئەو مردنەی كە "تەنها لە بەهەشتدا دەمرێـت" بكوژیت و.. ئەم ئامێری خاچەش لابەریت كە بە نـاخی زەویـدا و بە فەرمـانی فەرمانڕەوای زەوی داكوتراوە، واتە بە گۆڕینی ئەم زەوییە بە زەوییەكی تر ئامێری نەمان لا ببەیت و.. شیفای ئەم برینەش بدەیت كە بەسەر هەموو ژیانمـدا زاڵە، ئەوەش بەوەی كە ژیانە فانی و دەستەوسانەكەم بۆ بگۆڕیت بە ژیانێكی بـاقی و بەردەوامی ئەوتۆ كە توانای ڕەهابوونی ببێـت و.. ئەم دمەڵەش چـاك بكەیـتەوە كە هەموو لایەكی منی گرتووەتەوە، بەوەی كە زاتە هەژارەكەی من بگۆڕیـت بە زاتێكی هەمیشەیی و دەوڵەمەندی ڕەها..

ئەگەر ئەم چوار كارەت لە تواناداا نەبێت، ئەوا ئەی شەیتانی مەست! مەگەر كەسـێكی مەسـتی وەك خـۆت بخەڵەتێنیـت كە نەتـوانێ پێكەنـین و گریـان، مانەوە و فەنا، دەرد و دەرمان، هەوا و هودا، لە یەك جیا بكاتەوە..

بەڵام من خوای گەورەم سەروزیادە، كە باشترین پەنا و پشتیوانە.

* * *

جا ئەگەر لە نهێنیـی ئەم نمـوونەیە تێگەیشـتیت، یـاخود حەزت كـرد ڕووە ڕاستەقینەكەی ببینیت، ئەوا بزانە كە:

قوتابیانی شارستانێتیی هەرزە و گومڕا و، خوێندكارانی فەلسەفەی نەخۆشی سەرلێشێوێن، بە چەند هەڵپەیەكی سـەیر و سـەمەرە و لەخۆبـاییبوونێكی نـامۆ دووچاری مەستی بوون و، ئنجا هـاتوون داوا لە موسـڵمانان دەكەن كە شـوێن

داب و نەریتی بیانییەکان بکەون و، دەستبەرداری چەندین شەعائیری ئەوتۆ ببن کە شعوور و هەستکردنی تێدایە بە ڕووناکییەکانی ئیسلام..

قوتابیانی قورئانیش بەوە ڕووبەڕوویان دەبنەوە کە پێیان دەڵێن:

ئەی گومڕایانی بێئاگا!

ئەگەر دەتوانن "نەمان" و "مردن" لە دنیا و، "دەستەوسانی" و "هەژاری"یـش لە مرۆڤدا لاببەن، ئەوا لە ئایین و شەعائیرەکانیشی بێنیاز ببن.

دەنا زارتان دابخەن و، دەستبەرداری خورتە و بۆڵە و وەسوەسەکانتان ببن کە وەك ویزەی مێش وایە لە نێوان نرکەی ئەم چوار هەورەگرمەیە و، لە ئاستی ئەو ئایەتە تەکوینییانەشدا کە بە دەنگی تابڵێی بەرزیان داوای شوێنکەوتنی ئایین دەکەن، ئەوەش بە شوێنکەوتنی شەعائیرەکانی:

﴿وإِذا قُرِىءَ الْقُرآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الأعراف: ٢٠٤).

بەڵێ، شێری ئەجەل لە پشت سەرمەوەیە و هەمیشە هەڕەشەم ئاراستە دەکات. جا ئەگەر بە بیستنی ئیمان گوێبیستی زایەڵەی قورئان بم، شێرەکەم بۆ دەبێت بە ئەسپ و، فیراقیش بە بوراقێك کە دەمگەیەنێتە میهرەبانیی بەخشندەی میهرەبان و بۆ خزمەت سەروەری بەسۆز و بەخشندەم. دەنا مردن دەبێتە شێرێکی دڕندە و، بە بێ حەزی خۆم پارچە پارچەم دەکات و، بۆ هەتاهەتایی لە سەرجەم خۆشەویستانم دامدەبڕێ..

هەروەها چەندین ئامێری فەنا و نەمان لە بەردەممدا دانراون کە لە بەدوادا هاتنی شەو و ڕۆژەوە شۆڕ بوونەتەوە و، چەندین ئامرازی تیاچوون و جودایم لە بەردەستدان کە لەسەر شەپۆلی وەرز و چەرخەکانەوە شەپۆلیان داوە. ئەم ئامێر و ئامرازانەش بۆ لەخاچدانی من و سەرجەم خۆشەویستانم ئامادە کراون..

جا ئەگەر بە گوێی "دڵنیایی" گوێبیستی ڕێنمایی قورئان بم، ئەوا سەرجەمی ئەو ئامێرانە دەگۆڕێن بە کەشتی و ئامێری سواربوون بۆ گەشتوگوزار لەناو ڕووبـاری زەمـان و دەریـای دنیـادا، بە مەبەستی بینینـی نوێبوونەوەی ئەو کاروبارانەی توانستی خواوەنـد کە بەسـەر لاپەڕەی وەرزەکانـدا دەردەکەون، بە زەمبەلەکی خۆر و گەشتی مانـگ و خـولانەوەی زەوی کە بە مێـزەری شـەو و ڕۆژ سەری دەپێچێتەوە و، کراسی هاوین و زستان دەپۆشێت..

هەروەها بە مەبەستی بینینی نوێبوونەوەی درەوشانەوەی ناوەکان بەسەر تیادەرکەوتووە بەخورەکان و، ئاوێنە گۆڕاوەکان و، تابلۆ ئاڵوگۆڕبووەکانی بەدوای یەکداهاتنی شەو و ڕۆژدا.

هەروەها لە تەنیشتی لای ڕاستمەوە دمەڵێکی هەژاریی بێسنوورم بەسەردا زاڵە.

جا هاودەم لەگەڵ ئەوەی کە دەستەوسانیم لە هـی کـۆڵەوارترین زینـدەوەر زیاترە، لە هەمووشیان هەژارترم.

واتە پێداویستییە ماددی و مەعنەوییەکانم هێنـدەی پێداویستییەکانی هەموویانە. لە هەمان کاتدا توانام لە کارایی چۆلەکەیەك کەمترە..

جا ئەگەر چارەسەری شیفابەخشی قورئان بەکاربهێنم، هەژارییە ڕەها ئازاربەخشەکەم دەگۆڕێت بە شەوقێکی بەتـام بۆ ئامـادەبوون لە میوانـداریی میهرەبانیدا و، حەزێکی ناسك بۆ بەدەستهێنانی بەروبوومەکانی میهرەبانیی بەخشندەی دلۆڤان. ئیتر چێژی هەژاری و دەستەوسانیم گەلێ زیاتر دەبێت لە چێژی هێز و دەوڵەمەندی. دەنا لە ناوەندی ئازاری وەڕسکاری پێویستییەکان و، ڕسوایی سواڵ و، هەوڵی پەرستنی هەرشتێك پێداویستییەکی منی لەلا بێت و، لە سەرشۆڕیدا بۆ هەموو شتێك، دەمێنمەوە.

هەروەها لای چەپیشم برینێکی قووڵی تێدایە، کە دەستەوسانی و لاوازیی بێسنووره لە بەرامبەر چەندین دوژمن و مەترسیی لەژمارەبەدەرەوە. ئەوەتا ئازاری "ترس" چێژی ژیانی دنیا ناهێڵێت و لەناوی دەبات.

جا ئەگەر بە ملکەچییەوە گوێبیستی بانگەوازی قورئان بم، ئەوا دەستەوسانییەکەم دەگۆڕێت بە دەعوەتنامەیەك بۆ پشتبەستن بە خاوەن توانستی ڕەها و، پەیوەستبوون لە ڕێی "تەوەککول"ەوە بە خاڵێکی پشت پێ بەستنی ئەوتۆ کە بێ وەیی و ئاسایشی تێدایە لە مەترسیی دوژمنان.

دەنا بە دەستەوسانییەکی لەڕادەبەدەر و، بە شپرزەیی لە نێوان چەندین دوژمنی بێسنووری ناحەزی یەکتردا، دەمێنمەوە.

هەروەها من لەسەر ڕێی سەفەرێکی درێژخایەنم، کە بەناو گۆڕ و حەشردا بەرەو ئەبەد تێدەپەڕێت. نە زانست و نە ژیریش ڕووناکییەکمان پیشان نادات کە تاریکایی ڕێگامان بۆ ڕوون بکاتەوە و، ڕۆزییەکیشمان پێ نابەخشێت کە ببێتە توێشووی ئەو سەفەرە، مەگەر ئەوەی کە لە خۆری قورئان و گەنجینەی خواوەندی میهرەبان وەربگیرێت.

جا ئەگەر جگە لە برینی ئەم ڕێیە "بە گومڕایی"، (کە بریتییە لە قبوولکردنی کەوتنە خوارەوە بۆ ناو دەمی گۆڕ لە سامی تاریکستانی ئەو "نەبوون"ەی کە گەلێ ترسناکتر و سامناکترە) ڕێیەکی تر شك دەبەیت، بیڵێ و باسی بکە.. دەنا بێدەنگ بە، تاکو قورئان قسەی خۆی بکات.

خۆ دوای ئەوەی کە ئەم پێنج ئایەت و نیشانەیەی کتێبی جیهان، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزی بەسەر مرۆڤدا خوێندەوە کە دەفەرموێ:

﴿فَلا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيوٰةُ الدُّنْيا ولا يَغُرَّنَّكُمْ باللّٰهِ الغَرُورُ﴾ (لقمان: ٣٣)..

ئیتر چۆن دەگونجێ شوێن تۆی ساویلکە و لەخۆبایی بکەوم؟

خۆ مەگەر کەسێك بە شەرابی سیاسەت، یاخود هەڵپەی ناوبانگ، یان حەز کردن بە سومعە، یاخود نەرمیی ڕەگەز، یان ئیلحادی فەلسەفە، یاخود بە هەرزەیی شارستانێتی و، شتانی مەستکەری چەشنی ئەمانە مەست بووبێت، دەنا کەس مەشرەب و ڕێبازت هەڵنابژێرێت..

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو چەپۆکانەی کە ئاراستەی سەری مرۆڤ دەکرێن و، ئەو ڕووداوە ترسناکانەش کە بە وێنەی زلـلە لە ڕوخساری دەوەشێنرێن، مەستییەکەی لەبیر دەبەنەوە.

ئنجا ئەوەش هەیە کە مرۆڤ وەکو ئاژەڵ نییە کە تەنیا گیرۆدەی ئازارەکانی دنیا بێت، بەڵکو هاودەم لەگەڵ ئازارەکانی ئێستایدا، ترسی ئایندەی و خەفەتەکانی ڕابوردووش، زللەی خۆیان لە سەر و ڕووی دەسرەوێنن.

جا ئەگەر دەتەوێ لە سەرجەمی زیندەوەران بەدبەختتر و ڕسواتر و نەفامتر و وێڵتر نەبیت، ئەوا بە هەستەوەری بیستنی ئیمان، گوێڕایەڵ و گوێبیستی مژدەی قورئان بە لەم ڕاگەیاندنەیدا کە دەفەرموێ:

﴿أَلَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ۞ الَّذِينَ ءامَنُوا وكانُوا يَتَّقُونَ ۞ لَهُمُ الْبُشْرىٰ فِي الْحَيوٰةِ الدُّنيا وفِي الآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمٰتِ اللَّهِ ذٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ (يونس: ٦٢-٦٤).

* * *

# وانەی چوارەم[1]

﴿إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ ۞ وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ (الانفطار: ١٣-١٤).

ئەی سەعیدی بێئاگا!

**بزانە کە:**

هەموو کەسێك لە سەفەری ژیانیدا دوو ڕێگای بەرەو گـۆڕ لە بەردەمـدایە. هەردوو ڕێگاکەش لە کورتی و درێژیدا یەکسانن..

بەڵام یەکێکیان، وێڕای ئەوەی بێ زیانە، بە شایەتی و کۆدەنگی موتەواتیری بینەران، سوودێکی مەزنیشی تێدایە و، نۆ لە دەی ڕێبوارانی ئەو ڕێیە بەو سوودە مەزنە دەگەن.

ئەوی تریان، وێڕای ئەوەی کە بە یەکگرتنی قسەی هەمووان هیچ سوودێکی تێدا نییە، بە کـۆدەنگی شـارەزا و بینەرانـیش زیـانێکی مەزنی تێـدایە. چـونکە گریمـانی ئەو زیـانە [ڕێـژەکەی] نـۆ لە دەیە. بەڵام ئەو کەسـەی دەیگـرێتەبەر چەك و توێشوو لەگەڵ خـۆی هەڵناگرێـت و، بە ڕواڵەت کـۆڵی سـووکە و، لە قورسایی یەك "مەن"[2] ڕزگاری دەبێت، بەڵام سەد مەن مـنەت لەسـەر "دڵ"ی

(١) دانەر وانەی چوارەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نـووری"دا ل: (٥٧٣-٥٧٦) داڕشتووەتەوە. لە "وتەی سێهەم"یشدا ناوەرۆکەکەی هێناوە. بـڕوانە: (وتەکـان) ل: ١٣-١٦؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٣٤-٣٨. (وەرگێڕ)

(٢) دەکاتە کەمتر لە هەشت کیلۆگرام. (وەرگێڕ)

خۆی هەڵدەگرێت و، کۆڵی قورسی مەترسی و ڕووداوە ترسناکەکانیش دەخاتە ئەستۆی "گیان"ی.

جا لەبەر ئەوەی "نموونەهێنانەوە" بۆچوونەکانی "ژیری" بە وێنەی شتی "هەستپێکراو" پیشان دەدات، ئەوا نموونەیەك بۆ ئەم ڕاستییە دەهێنینەوە:

بۆ نموونە:

دەتەوێ بڕۆیت بۆ ئەستەمبووڵ.. یان دەتنێرن بۆ ئەوێ..

هەر لە لای دەستەڕاست و دەستەچەپی خۆتەوە دوو ڕێگا بەرەو ئەوێ هەیە، کە هەردووکیان لە ڕووی کورتی و درێژییەوە یەکسانن، بەڵام لە ڕووی سوود و زیان و کۆڵسووکی و قورسیی ئەرکەوە جیاوازن. چونکە ڕێگای لای "دەستەڕاست" بە کۆدەنگی بینەران و پسپۆڕان و یەکگرتنیان، سوودێکی زۆری بێ هیچ زیانێکی تێدایە و، ڕێبواری ئەو ڕێیە دەبێ چەك و توێشوویەکی هێندەی کێشی یەك مەن هەڵبگرێت، لەگەڵ ئەمانەشدا "گیان" و "دڵ"ی لە قورسیی هەڵگرتنی ئەو ترس و منەتە ڕزگاریان دەبێت کە هێندەی چیاکان قورسن..

ڕێگای "دەستەچەپ"یش، بە شایەتیی ملیۆنەها کەس لە شارەزایان و بینەران و یەکگرتنی لایەنگران و نەیاران، زیانبەخش و بێسوودە، هەرچەندەش لە ڕواڵەتدا کۆڵی ئەو کەسەی دەیگرێتەبەر کۆڵێکی سووکە، لەبەر ئەوەی چەکی بەکاری پێویست و توێشووی بەلەزەتی پێویستتری هەڵنەگرتووە، بەڵام لە بریی یەك "قیتی"[1] چەك، چەندین کۆڵی قورسی مەترسیی لە ئەستۆی "گیان"ی و، لە جیاتی چوار هۆقەش[2] توێشوو، سەد مەن منەتی لە سەر پشتی "دڵ"ی ناوە..

(١) کێشانەیەکە یەکسانە بە (١,٢٨٢ گم). (وەرگێڕ)

(٢) دەکاتە پێنج کیلۆگرام، یان شتێك زیاتر، بە پێی جیاوازیی شوێنەکان. (وەرگێڕ)

هەمــوو بیــنەرانی ڕاســتگۆ هەواڵــمان دەدەنــێ کە ئەو کەســانەی بەهــۆی بەرەکەتی ئـیمانەوە ڕێــی دەستەڕاســت دەگــرنەبەر، لە مــاوەی بڕینــی ڕێگــادا ئاسوودە و بێ وەی دەبن و، کاتێکیش کە دەگەنە شاری مەبەست نـۆ لە دەیـان سوود و قازانجێکی گەورەیان دەست دەکەوێت..

ئەوانەش کە بەهـۆی شــوومیی گــومڕایی و، بەتــاڵی و، گەمـژەییەوە ڕێــی دەستەچەپ دەگرنەبەر، لە ماوەی بڕینــی ئەو ڕێگــایەدا لەتــاو تــرس و برسـێتی دووچاری گەلێ پەرێشانی و شپرزەیی دەبن و، هەموو یەکێکی ئەوان لەبەر ئەو ترسەی کە هی لاوازیی دەستەوسانییەتی، لە بەردەم هەموو شتێکدا دادەبەزێـتە ئاستێکی نزم و، لەبەر پێداویستیی هەژاریـیەکەشی، خـۆی بـۆ هەمـوو شـتێك ڕسوا و سەرشۆڕ دەکات. خـۆ ئەگەر بیشـگەنە شـاری مەبەسـت، لەوێ بەنـد دەکرێن یان دەکوژرێن، مەگەر یەك دوانێکیان ڕزگاریان ببێت.

هەرکەسێك کەمترین ژیریی هەبێـت، هەرگیـز لەبەر کۆڵسـووکییەکی کەم، ڕێگایەکی زیانبەخش بەسەر ڕێگای بێ زیاندا هەڵنابژێرێت، ئیتر چـۆن دەچـێ ئەو ڕێگایە هەڵدەبژێرێت کە لە سەدا نەوەد و نۆ گریمانی مەزنترین زیـانی تێـدا بێــت بەســەر ئەو ڕێگــایەدا کە لە ســەدا نەوەد و نــۆ گــریمانی بەدەســتهێنانی مەزنترین سوودی تێدا هەبێت، تەنها لەبەر کۆڵسووکییەکی جوزئی لە ڕواڵەتدا، کە کۆڵقورسییەکی هەمەکییە لە ڕاستی و ناوەرۆکدا؟!

جا ئەو ڕێبوارە؛ تۆیت..

ئەستەمبووڵیش؛ جیهانی بەرزەخ و ئەودنیایە..

ڕێگای دەستەڕاست؛ ڕێی قورئانە، کە لە دوای ئیمان فەرمـان بە نـوێژکردن دەدات..

ڕێی دەستەچەپیش؛ ڕێگای لە ڕێ لادەران و یاخیبووانە..

شارەزا و بینەرانیش؛ ئەولیا بینەرەکانن..

چونکە کەسی خاوەن ویلایەت، لە ڕاستییەکانی ئیسلامدا خاوەنی چێژێکی بینەرە، ئەوەی کەسی عەوام بە "چاولێکەری" باوەڕی پێ دەهێنێت هەندێ جار وەلی بە "بینین" دەیبینێت..

چەك و توێشـــووەکەش؛ لەو تەکلـیفەی خواوەنـــددایە لە بەنـــدەکانی کە "پەرستش" لەخـۆ دەگرێـت، کە ئەویـش "نـوێژ"ی لەخـۆ گرتـووە و، ئەویـش وشـەی "تەوحیـد" کـاکڵەیەتی و، ئەویـش دوو خـاڵی "پشـت پـێ بەسـتن" و "یارمەتی لێ وەرگرتن"ی لەخۆ گرتووە، کە هەردووکیـان "پشتبەسـتنی مـرۆڤ" بەرهەم دەهێنن بە خواوەندی بەتوانای پارێزەری زانا و دەوڵەمەندی بەخشندە و میهرەبان..

ئیتر بەم توێشووە، مرۆڤ لە دابەزینی بۆ ئاستە نزمەکان و، لە زەلیلی نواندن بۆ هەر شتێك کە زیان یان سوودێکی تێدا بێت، ڕزگاری بووە، چـونکە "لا إلَـٰهَ إلاّ اللّـه" ئەوە دەگەیەنێـت کە جـگە لە خـوا کەس ناتوانێـت سـوود و زیـان بگەیەنێت و، هەرچی سوود و زیانیشە تەنها و تەنها بە ئیزن و فەرمانی ئەوە.

* * *

# وانەی پێنجەم[1]

﴿وَما هٰذِهِ الْحَيٰوةُ الدُّنْيا إِلاّ لَهْوٌ ولَعِبٌ وَإِنَّ الدّارَ الآخِرةَ لَهِيَ الْحَـيَوانُ﴾ (العنكبوت: ٦٤)

ئەی "سەعید"ی لەسەر سەفەر بەرەو پیری؛ بەرەو گۆڕ؛ بەرەو حەشر؛ بەرەو ئەبەد!

**بزانە کە:**

ئەو تەمەنەی کە خاوەنەکەت بە مەبەستی بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی هەردوو ژیانت، بە پێی کورتی و درێژییان، پێی بەخشییت، تۆ هەموویت بۆ ئەم ژیانە فانییە بەزایە دا کە وەك دڵۆپێك سەراب وایە لەچاو دەریادا!

ئەگەر ژیریت لەسەردایە، ئەوا نیوەی تەمەنت یان سێیەکی لانی کەم دەیەکی، بۆ ژیانە باقییەکە بخەرەکار.

جێی سەرسوورمانە کە بە کەسانی وەك تۆ، لەوانەی لە هەموو کەسێك نەفامترن، بوترێ: مرۆڤێکی ژیرە و، چەند زانستێك دەزانێت!

بۆ نموونە:

ئایا لەو کۆیلەیە نەفامتر شك دەبەیت کە گەورەکەی بیست و چوار دیناری پێ دا و، لە "بوردوور"ەوە ناردی بۆ "ئەنتالیا"، لەوێوە بۆ "شام"، لەوێوە بۆ

---

(١) دانەر وانەی پێنجەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٧٦-٥٧٨) داڕشتووەتەوە. لە "وتەی چوارەم"یشدا ناوەرۆکەکەی هێناوە. بڕوانە: (وتەکان) ل: ١٧-١٩؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٣٩-٤٢. (وەرگێڕ)

"مەدینە"، لەوێوە بۆ "یەمەن" و، فەرمانیشی پێ دا کە ئەو دینارانە لە پێداویستییەکانی سەفەرەکەیدا خەرج بکات، بەڵام تا ڕادەیەك سەربەستە کە هەتا ئەنتالیا بە پێ بڕوات و، گەر هیچیش خەرج نەکات هەر دەگات. بەڵام بۆ شوێنەکانی تر نابێ بە پێ بڕوات، چونکە ئەگەر بلیتێکی سواربوونی کەشتی یاخود شەمەندەفەر یان فڕۆکە بکڕێت، ئەوا ماوەی مانگە ڕێیەك بە ڕۆژێك دەبڕێت،، دەنا بە پێ و بە تەنیایی و دەربەدەری و سەرگەردانی، ڕێ دەگرێتە بەر..

کەچی ئەو گەشتیارە گەلحۆیە بیست و سێ دیناری لە ماوەی دوو ڕۆژدا خەرج کرد!

پێی وترا: هیچ نەبێ ئەو یەك دینارە بۆ توێشووی سەفەرە درێژخایەنەکەت خەرج بکە، بەشکو گەورەکەت بەزەیی پێتدا بێتەوە.

وتی: نەخێر لەوەدا خەرجی ناکەم، چونکە گریمان هەیە سوودی نەبێت.

پێی وترا: چەندە سەیرە گەلحۆیی تۆ گەیشتووەتە ئەم ڕادەیە! چونکە ژیریت چۆن بوارت دەدات نیوەی سامانت کە چل و هەشت دینارە لە قوماری یانسیبدا فڕێ بدەیت، لە کاتێکدا کە هەزار کەس بە ئومێدی بەدەستهێنانی هەزار دینار بەشداریی تێدا دەکەن و، گریمانی ئەم بردنەوەیەش یەك لە هەزارە..

ئەی بۆچی ئەم ژیرییەت ڕێنماییت ناکات کە یەك لە بیست و چواری سامانەکەت بۆ بەدەستهێنانی چەندین گەنجینەی نەبڕاوە ببەخشیت، کە بە شایەتیی ملیۆنان کەسی شارەزا و پسپۆڕ، ڕێژەی بەدەستهێنانی لە هەزاردا نۆسەد و نەوەد و نۆیە، لە کاتێکدا بۆ ئەم چەشنە سوودە گەورانە بایەخ بە هەواڵی یەك کەسی عەوام دەدرێت..

ئەی دەبێ هەواڵدانی ئەو کەسانە چەندە جێی بایەخ بێت کە خۆر و ئەستێرەی موتەواتیری گرۆی مرۆڤن و، ئەو بینەرانەن کە قسەی دوو چەسپێنەر

لەوان بەسەر قسەی هەزاران کەسدا پێش دەخرێت کە نەفی و نکوولّیی لێ دەکەن، وەك ئەوەی کە قسەی دوو شایەت بۆ بینینی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان بەسەر قسەی هەزاران کەسدا زاڵ دەکرێت کە ئینکاریی بینینی بکەن!

جا ئەو بەندە گەشتیارە؛ تۆیت..

"بوردوور"؛ دنیاکەتە.

"ئەنتالیا"؛ گۆڕە..

مەبەستیش لە "شام"؛ بەرزەخە..

بەڵام "یەمەن"؛ شوێن و ڕووداوەکانی دوای حەشرە..

"بیست و چوار دینار"ەکەش؛ بیست و چوار سەعاتی تەمەنی ڕۆژانەیە، کە بیست و سێ سەعاتی لە بەرژەوەندییەکانی دنیای فانیدا بەکار دەبەیت، کەچی سستی دەنوێنیت لە بەسەربردنی تەنیا سەعاتێك لە ئەنجامدانی پێنج فەرزەی نوێژدا کە پێویستترین توێشووی ئەو گەشتە درێژخایەنەیە!

ئەم نموونەیە، بۆ ڕوونکردنەوەی یەکێك لە نهێنییەکانی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

﴿وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتقِينَ ۞ وَبُرِّزَتِ الْجَحِيمُ لِلْغاوِينَ﴾ (الشعراء: ٩٠-٩١).

* * *

# وانەی شەشەم(١)

﴿مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ﴾ (النساء: ٧٩).

ئەی سەعیدی لەخۆبایی شانازیکار بە شتێکەوە کە نەتکردووە!

**بزانە کە:** مافی شانازی و لەخۆبایی بوونت نییە!

چونکە جگە لە خراپە و ناتەواوی شتێکی ترت تێدا نییە کە لە لایەنی خۆتەوە بێت! خۆ ئەگەر خێرێك هەبێت، ئەوا بە وێنەی "جوزئی ئیختیاری"یەکەت ئەویش خێرێکی جوزئییە. بەڵام بەو جوزئە ئیختیارییەت "خراپە"ی زۆر ئەنجام دەدەیت، چونکە بەروبوومی هەموو ئەو هۆکارانەی ڕوویان لە ئامانجەکەی تۆیە، بە ناتەواوی و کەمتەرخەمیی خۆت هەڵیان دەوەرێنیت. ئیتر شایانی زیانێکی هەمەکی و شەرمەزارییەکی گشتی دەبیت.. بەڵام تۆ کێشەکەت پێچەوانە کردووە و، بوویت بە "فیرعەون".

تۆ لەمەدا وەکو کەسێکی لەخۆبایی نەفام وایت کە لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکدا بوو بە هاوبەشی بازرگانیی ناو کەشتییەك. ئیتر هەر کەسە و ئەرکی سەرشانی خۆی ڕاپەڕاند، ئەم نەبێت ئەرکی خۆی جێبەجێ نەکرد کە کارێك

---

(١) دانەر وانەی شەشەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٨٢-٥٨٥) داڕشتووەتەوە. ناوەرۆکەکەشی بە پەرش و بڵاوی لە چەند شوێنێکی پەیامەکاندا هێناوە، لەوانە: خاڵی یەکەمی وتەی هەژدەهەم؛ باسی یەکەمی وتەی بیست و شەشەم لە کتێبی(وتەکان)؛ ئاماژەی سێهەم و چوارەم و دوازدەهەمی بریسکەی سیازدەهەم لە کتێبی (بریسکەکان). (وەرگێڕ)

بوو بەهۆیەوە کەشتییەکە دەجوولاّ و دەڕۆشت، هەتا لە دەرەنجامدا کەشتییەکە نغرۆ بوو، هەروەك زیانی هەزار دیناریشیان لیّ کەوت.

پێی وترا:

لە ڕاستیدا دەبیّ تۆ هەموو زیانەکە بژێریت.

وتی:

نەخێر.. بەسەر هەموومانـدا دابەش دەکرێـت و، منـیش بەشی خـۆمم لەو زیانە بەردەکەوێت!

پاشان لە گەشتێکی دیکەدا، بە هەمان شێوەی جاری پێشوو هاوبەشییان لە بازرگانیدا کرد، ئەم جارە هەزار دیناریان قازانج کرد.

پێی وترا:

با قازانجەکە بە پێی دەسمایەکە دابەش بکرێت.

وتی:

نەخێر.. هەموو قازانجەکە هی منە، چونکە جاری یەکەم وتـان: دەبـیّ تـۆ هەموو زیانەکە بژێریت!

پێی وترا:

ئەی نەزان!

"بـوون" بەنـدە بە بـوونی هەمـوو هەلـومەرج و بەشـەکانی شـتە خـاوەن "بوون"ەکەوە. کەواتە بەروبـوومی شـتە "بـوو"ەکە دەدرێـت بە هەمـووان. خـۆ قـازانجیش "وجـوود"ی هەیە و دارای "بـوون"ە. بەلاّم زیـان بەروبـوومی "نەبوون"ە، لەگەلّ ئەوەشدا هەمـوو شـتە "بـوو"ەکە بە "نەبـوون"ی بەشـێك لە بەشەکانی، یان لە دەستچوونی مەرجێکی، دەفەوتیّ و نامێنێت.

دەسا ئەی بەناو "سەعید"(بەختەوەر) و، بە جەستەش بەدبەخت!

بەروبوومی "نەبوون" دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەسەی هۆکاری ئەو "نەبوون"ەیە. کەواتە مافی شانازی و لە خۆباییبوونت نییە.

**یەکەم:**

لەبەر ئەوەی "شـــــەڕ" لە لایەنی تـــــۆوەیە و، "خێـــــر"یش لە لایەنی پەروەردگارتەوە.

**دووهەم:**

لەبەرئەوەی "شەڕ"ت هەمەکییە و، "خێر"یشت هەندەکی.

**سێهەم:**

لەبەر ئەوەی پێش ئەنجامـدانی کـارە چـاکەکەت، کرێکەیـت وەرگرتـووە. تەنـانەت هەمـوو چاکەکارییەکانـت لەگەڵ یەك لە دەی، دە یەکی، یەك لە دەی ئەو نیعمەتانەدا یەکسان دەرناچێت کە ئەو کەسە پێی بەخشیویت تۆی کـردووە بە "مرۆڤێکی موسڵمان".

هەر لەم نهێنییەوەیە کە "بەهەشـت" تەنهـا چـاکە و بەخششـێکی خـواییە و، "دۆزەخ"یش عەینی دادگەری. چونکە مرۆڤ بە کردارە "شـەڕ"ە جـوزئی و یەك چرکەییەکەی خۆی، تاوانێکی هەمەکی و بەردەوام ئەنجام دەدات.

**چوارەم:**

"خێر" کاتێ بە "خێر" دادەنرێت کە بۆ خوای گەورە بێت. جا ئەگەر بـۆ ئەو بـوو، ئەوا پشـتگیری و سـەرکەوتن تیایـدا هەر لە لایەن خـوای گەورەوەیە و، منەتیش هەر لەو دەزانرێت. کەواتە مافی ئەو خێرە "شـوکرانە"یە، نەك ئەوەی بە پیشاندانی ئەو چاکەیە لە پێش چاوی خەڵکـدا و بە ڕیـاکردن تیایـدا، شـانازیی پێوە بکرێت، کە کارێکە ئەو "خێر"ە دەگۆڕێت بە "شەڕ".

جا لەبەر ئەوەی تۆ ئەم ڕاسـتییەت نەزانی، ئەوا لە خـۆت بـایی بوویـت و، غەیـری خۆیشـــت لەخشـــتەبرد. ئەوەتـا ئەو چـاکەیەی کە بەرهەمـی کـرد و کۆششـی "کۆمەڵ"ە، دەیگێڕیتەوە بۆ خۆت و ئەو غەیرە. ئیتر لە پـێش چاوتـدا

دەبنە فیرعەون و خاوەنی ئەو چاکەیە. تەنانەت سامان و کردارەکانی خوای گەورەش بەسەر هەموو "تاغووت"ەکاندا دابەش دەکەیت.

هەروەها نیشانەیەکی نەزانیت لەوەدایە کە ئەو "خراپکاری"یانەت کە - بە دەق - لە لایەن خۆتەوە هاتوون، تۆ بە مەبەستی هەڵهاتن لە بەرپرسیاریتی، دەیانگێڕیتەوە بۆ "قەدەر"!!

هەروەها "چاکەکاری"یەکان کە - بە دەق - بەشێکن لە ڕێژنەی چاکەی بەدیهێنەرت، دەگێڕیتەوە بۆ خۆت و، خۆت دەکەیت بە خاوەنیان، تاکو لەسەر شتێك ستایش و سوپاس بکرێیت کە ئەنجامت نەداوە!

دەسا بەو ئەدەبەی قورئانی پیرۆز ڕەفتار بکە، کە دەفەرموێ:

﴿مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ﴾.

کەواتە تەنها ئەو شتە بە هی خۆت بزانە کە لە ڕاستیدا هی تۆیە و، ئەوەش زەوت مەکە کە هی تۆ نییە.

هەروەها بەو ئەدەبەی قورئان ڕەفتار بکە کە دەریدەخات پاداشتی "خراپە" هێندەی خۆیەتی، بەڵام پاداشتی "چاکە" دە هێندەیەتی:

﴿مَنْ جاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثالِها وَمَنْ جاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَها﴾ (الأنعام: ١٦٠).

لەبەر ئەوە، گەر کەسێك سیفەتێکی خراپی تێدا بوو، نەکەی لە پێش چاوتدا ئەو سیفەتە خراپەیەی بتەنێتەوە بۆ سەرجەم سیفەتەکانی تری و، بۆ خزمانیشی..

هەروەها خۆشەویستییەکەت بۆ کەسی "چاکەکار" پەرە پێ بدە هەتا دەگاتە ئەوەی خزمەکانی ئەویشت خۆش بوێت و، چاوپۆشی لە نەنگییەکانی بکەیت.

* * *

# وانەی حەوتەم[1]

﴿وَما خَلَقْتُ الْجِنَّ والإنْسَ إلاّ لِيَعْبُدُونِ ۞ ما أُرِيْدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وَما أُرِيْدُ أنْ يُطْعِمُونِ ۞ إنَّ اللّـهَ هُوَ الرَّزَّاقُ ذُو الْقُوَّةِ الْمَتِيْنُ﴾ (الذاريات: ٥٦-٥٨).

ئەی سەعیدی بێئاگای خۆهەڵقورتێنەر لە کاروباری غەیری خۆتدا!

بزانە کە: تۆ واز لە ئیشەکانت دەهێنیت و، خۆت بە کاری پەروەردگارتەوە خەریك دەکەیت! کەواتە هەندێ لە ستەم و نەزانییەکانت لەوەدایە کە دەچیت واز لە فەرمانبەریی سووك و ئاسانی "بەندایەتی" دەهێنیت کە لە تواناتدایە و، فەرمانبەریی "پەروەردگارێتی" لەسەر پشت و سەر و دڵی لاوازی خۆت هەڵدەگریت، لە کاتێکدا کە ئەو فەرمانبەرییە تایبەتە بەو کەسەی:

﴿خَلَقَكَ فَسَوّاكَ فَعَدَلَكَ ۞ في أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَاءَ رَكَّبَكَ﴾ (الانفطار: ٧-٨).

دەسا پابەندی کاری خۆت بە و لێی لامەدە و، لە کاری پەروەردگاردا خۆت هەڵمەقورتێنە، تاکو بەختەوەریت دەست بکەوێت و بحەوێیتەوە. دەنا دەبیتە کەسێکی یاخیی بەدبەخت و خیانەتکارێکی وێڵ.

تۆ لەمەدا وەکو سەربازێك وایت کە ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە مەشقی تایبەتی و جەنگ و جیهاد، پادشایش بە ئامادەکردنی پێداویستییەکانی، بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە یارمەتیی دەدات.

---

(١) دانەر وانەی حەوتەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٨٥-٥٨٧) داڕشتووەتەوە. بە فراوانتریش لە "وتەی پێنجەم"دا هێناویەتی. بڕوانە: (وتەکان) ل: ٢٠-٢٣؛ (وتە بچووکەکان) ل: ٤٣-٤٨. (وەرگێڕ)

بەڵام پادشــاکەی ئەرکــێکی تــایبەتی هەیە، کە دابینکــردنی ئــازووقە و پێداویستی و پۆشاك و تەنـانەت دەرمـانی نەخۆشییەکانیشـە بـۆ ئەو سـەربازە. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار سەربازەکە لە هۆکارەکانی ڕاییکردنی ئەم ئەرکەیـدا دەخاتە کار، بەڵام بە حسابی دەوڵەت، (نەك بە حسابی ئەو سەربازە).

جــا لە ڕوانــگەی ئەم نهێنیــیەوە، گەر پرســیار لە ســەربازێك بکەیـت کە خۆراکەکەی خۆی ئامادە دەکات، پێی بڵێیت: ئایا چـی دەکەیـت؟ لە وەڵامـدا دەڵێت: بێ بەرامبەر کار بۆ دەوڵەت دەکەم..

بەڵام ناڵێت: کار بۆ دابینکردنی ڕۆزیی خۆم دەکەم..

چونکە دەزانێت ئەم کارە هی دەوڵەتە، نەك هی خۆی. تەنـانەت گەر لەبەر نەخۆشی - بۆ نموونە - نەیتوانی پاروو ببات بۆ دەمی، ئەرکی دەوڵەتە پـارووی بۆ ئامادە بکات و بیکات بە دەمیەوە.

جا ئەو سـەربازەی (کـارەکەی خـۆی بەجێـدەهێڵێت و) دەچـێ خەریـکی کاسبی دەبێت بۆ بەدەسـتهێنانی ڕۆزیـی خـۆی، کەسـێکی نەزان و بەدبەخـتە؛ دەبێ سەرکۆنە و تەمێ بکرێت. ئەو کەسەش واز لە مەشق و جیهاد دەهێنێـت، خیانەتکار و یاخییە، لێدان دەخوات و بە قورسی سەرزەنشت دەکرێت.

ئەی سەعیدی بەدبەخت!

تۆ ئەو سەربازەیت..

نوێژەکانیشت، مەشقەکانتە..

"تەقوا"شـــت - بە وازهێنـــان لە گونـــاهە گەورەکـــان و، بەگژاچــوونەوەی دەروون و شەیتان - بریتییە لە جەنگ و جیهادت.

ئەمە ئامـــانجی بەدیهێنـــانی تـــۆیە. بەڵام خــوای گەورە هەر تەنهـا خـۆی پشتگیر و یارمەتیدەرە.

ڕۆزیـیەکەت و، درێـژەدان بە ژیانـت و، هەمـوو ئەو شـتانەی وەك مـاڵ و منداڵیش کە پەیوەستن بە تۆوە، کاری بەدیهێنەرتە. ئەوەندە هەیە کە هەندێ جـار

لە هەندێ هۆکاری لەدەرگادانی گەنجینەکانی میهرەبانیی خۆیدا، بە داواکردنی کردەیی یان بە زمانی حاڵ یان زمانی گوفتار، دەتخاتە کـار. لەوانەشـە هەنـدێ جـار بەو ڕێگایـانەدا بتبـات کە دەتگەیەنـنە شـوێنی ئامـادەکردنی خـۆراك و نیعمەتەکانی، ئیتر لەوێ بە زمانی توانا و لێهاتن، یان بە زمـانی پێویسـتی، یـان زمانی کردەیی (یان حاڵ یان گوفتار) داوای بەشە ڕۆزیـی دیـاریکراوی خـۆت دەکەیت.

دەسا تۆ چەندە نەزانیـت کە سـەبارەت بە ڕۆزیـیەکەت، کەسـێك تۆمەتبـار دەکەیت کە هێشتا منداڵێکی بچووك بوویت و هیچ توانا و دەسەڵاتێکت نەبـوو، خاوێنترین ڕۆزیی پێ دەبەخشییت!

هەر تەنها ئەو بیسەرە بینەرە بە توانا و دەوڵەمەندەیە کە ڕۆزیـی هەمـوو ئەو زیندەوەرانە دەدات کە ناتوانن ڕۆزی خۆیان هەڵبگرن..

هەر ئەوە کە لە وەرزی هاویندا زەوی دەکات بە کولێنەری ڕۆزی و خـۆراك بۆ میوانەکانی و، دەفری باخ و بێستانەکانیش هێندە لە ڕێژنەکـانی ئەو لێوانلێـو دەبن کە لێیان دەڕژێت و، قاپەکانی درەختەکانیش بە خۆشترین خۆراکی بە تـام پڕ دەکات.

کەواتە بە حساب و ناوی ئەو کەسە و، بە ڕوخسـەتی ئەو، لەو شـتەدا کـار بکە کە دوای ئەنجامدانی ئەرکە سەرەکییەکەت، تۆی تێدا بەکارهێناوە.

خـــۆ ئەگەر نەگونجــا ئەو دوو ئەرکە پـــێکەوە کـــۆبکەیتەوە، ئەوا ئەرکە سەرەکییەکەت ڕابپەڕێنە و، پشت تەنها بەو ببەستە و، بڵێ:

﴿حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ﴾ (آل عمران: ١٧٣)..

﴿نِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ﴾ (الأنفال: ٤٠).

* * *

# وانەی هەشتەم[1]

﴿وَإِذا سَأَلَكَ عِبادي عَنّي فَإِنّي قَريبٌ أُجيبُ دَعْوَةَ الدّاعِ إِذا دَعانِ﴾ (البقرة: ١٨٦).

﴿أُدْعُوني أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر: ٦٠).

﴿قُلْ مَا يَعْبَؤُا بِكُمْ رَبِّى لَوْلا دُعاؤُكُمْ﴾ (الفرقان: ٧٧).

ئەی ئەو کەسەی کە پێی وایە دوعا دەکات و گیرا نابێت!

**بزانە کە:**

"دوعـا" پەرستشـە. خـۆ بەروبـوومی ئەویـش لەو دنیـادایە. بەڵام ئامـانجە دنیاییەکان "کات"ی ئەو دوعایانەن کە لە خۆیاندا جۆرە پەرستشێکی تایبەتین.

جـا هەروەك "خۆرئـاوابوون" کـاتی "نـوێژی شـێوان"ە و، مانـگ و خـۆر گیـرانیش کـاتی نـوێژی مـانگگیران و خـۆرگیرانە، نەك ئامانجیـان بـن و، "بێبارانی"ش کاتی "نوێژەبارانێ"یە، نەك ئەو نوێژە بـۆ ئەوە دانرابێـت کە بـارانی پێ ببارێت، بەڵکو پەرستشێکە لەبەر خوای گەورە ئەنجام دەدرێت و، کاتەکەی بەردەوام دەبێـت هەتـا بێبـارانی بێـت، بەڵام کە بـاران بـاری کـاتەکەی تەواو دەبێت..

---

(١) دانەر وانەی هەشتەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٨٨-٥٨٩) داڕشتووەتەوە. لە "وتەی بیست و سێهەم"یشدا پتر ڕوونی کردووەتەوە. بڕوانە: (وتەکـان) ل: ٤٥٧-٤٦٠؛ (مرۆڤ و ئیمان) ل: ١٨-٢٣. (وەرگێڕ)

بە هەمان جۆر، خۆزاڵکردنی ستەمکاران و، داباراینی بەڵا و گرفتەکان، "کات"ی چەند دوعایەکی تایبەتن کە هەتا ئەو کێشە و گرفتانە هەبن ئەو دوعایەش کاتەکەی بەردەوام دەبێت. جا ئەگەر بەو دوعایانە ئەو کێشە و گرفتانە لاچوون، ئەوا زۆر باشە و لە خوا بەزیاد بێت، دەنا گەر لانەچوون نابێ بوترێ: دوعاکە قبووڵ نەبووە، بەڵکو لە ڕاستیدا کاتەکەی تەواو نەبووە.

سەبارەت بە بەڵێنی "گیرابوونی دوعا"ش لە ئایەتی ﴿أُدْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾دا، ئەوا دەبێ بزانرێت کە:

"بەهاناوەچوون"ی دوعا جیایە لە "قبووڵ بوون"ی خودی دوعاکە. چونکە "بەهاناوەچوون" بە بەردەوامی هەیە، بەڵام هێنانەدیی خودی خواستەکە؛ شوێنکەوتەی "دانست"ی گیراکاری ئەو دوعایەن.

بۆ نموونە، بە پزیشکەکەت دەڵێیت: کاکی دکتۆر!

وەڵامت دەداتەوە و دەڵێت: بەڵێ.

ئنجا پێی دەڵێیت: ئەو خواردنە، یان ئەو دەرمانەم بدەرێ.

دکتۆرەکەت یان هەمان شتت دەداتێ کە داوات کردووە، یان لەوە باشتر. لەوانەشە لەبەر پێویستی نەخۆشییەکەت، ڕێت پێ نەدات کە هیچ شتێك لەوانە بخۆیت.

یەکێکی تر لە هۆکارەکانی "قبووڵ نەبوون"ی دوعا، گومانبردنی کەسی دوعاگۆیە کە ئەو دوعایە بۆ ئەو ئامانجە دنیاییانە بن..

بۆ نموونە:

پێی وایە "نوێژەبارانێ" بۆ ئەوە دانراوە کە بارانی پێ ببارێت، دیارە دوعای لەو جۆرە دوعایەکی بێگەرد و خاوێن نییە و، قبووڵ نابێت.

* * *

# وانەی نۆهەم[1]

﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ۞ وَطُورِ سِينِينَ ۞ وَهَٰذَا الْبَلَدِ الأَمِينِ ۞ لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ۞ ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ ۞ إِلَّا الَّذِينَ ءامَنُوا وعَمِلُوا الصَّالِحاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾ (التين: ١-٦).

**بزانە کە:**

کەماڵ و وردەکاریی سنعەت لە هەموو شتێکدا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردگاری هەموویان هەروەك لای هەموویانە لە هەموو شوێنێکدا، لە هیچ شوێنێکدا و لای هیچ شتێکیش نییە..

هەروەها مرۆڤیش لەبەر ئەوەی پێویستی بە هەموو شتێکە، هەر لە بچووکترین بەشی شتێکی هەندەکییەوە تا دەگاتە گەورەترین کوللی شتێکی هەمەکی، ئەوا شایانی ئەوە نییە هیچ کەسێ بپەرستێ، جگە لەو خوایەی کە جڵەوی هەموو شتێکی بەدەستە و گەنجینەی هەموو شتێکی لەلایە.

هەروەها "دەروونی مرۆڤ"یش لە ڕووی بوون و، بەدیهێنان و، چاکە و، کردارەوە، لەوپەڕی بچووکی و کورتی و ناتەواویدایە و، زۆر لە مێروولە و هەنگ نزمتر و، لە جاڵجاڵۆکە و مێشوولەش لاوازترە. کەچی لە ڕووی نەبوون و، کاولکاری و، خراپە و، کارتێکراوییەوە، زۆر لە زەوی و چیا و ئاسمانەکان گەورەترە!

---

(١) دانەر وانەی نۆهەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٥٦٩-٥٧٢) داڕشتووەتەوە. بە جۆرێکی فراوانتریش "وتەی بیست و سێهەم"ی بۆ تەرخان کراوە. بڕوانە: (وتەکان) ل: ٤٤٨-٤٧٩؛ (مرۆڤ و ئیمان). (وەرگێڕ)

بۆ نموونە:

ئەگەر "چاکە"یەك بکات، لە مەودای پێ گەیشتنی دەست و بـازووەکەی و هێزی خۆیدا دەیکات، بەڵام گەر "خراپە"یەك ئەنجـام بـدات، ئەوا خـراپەکەی دەتەنێتەوە و پەرە دەسێنێت..

جا مرۆڤ بە خراپەی "کافربوون"ی، سووکایەتی بەرامبەر کۆی بوونەوەران دەردەبڕێت، چونکە نرخ و بەهایان لەو لوتکە بەرزەوە، کە چەند نـووسراوێکی پەروەردگاری و چەند ئـاوێنەیەکن بـۆ تیـادەرکەوتنی نـاوە جوانەکـانی خـوای گەورە، دادەبەزێنێت بۆ نزمایی چەند ماددەیەکی بگـۆڕی ئەوتـۆ کە بە خێرایـی لەناو دەچن و، لە یەکتر دادەبڕێن و، دەستی ڕێکەوت یاریی هەڕەمەکێتییان پێ دەکات..

هەروەهـا بە کـافربوونی، پـلەی ئەو مـرۆڤە دادەگرێـت، کە هـۆنراوەیەکی خاوەن کێشی ئەوتۆیە درەوشانەوەی ناوە خاوێنەکان ئاشکرا دەکات و، نـاوك و تـۆوێکە بـۆ درەختـێکی بـاقی و نەبـڕاوە و، جێنشـینێکە بەهـۆی هەڵگرتنـی ئەمانەتەوە لە سەرووی مەزنترینی بوونەوەرانەوەیە..

مرۆڤ لەم پلە بەرزەوە بۆ پلەیەکی یەکجار نزم دەهێنێتە خوارەوە، کە لە هی زەلیلـترین زینـدەوەری لەنـاوچووی فـانی، ڕسـواتر و لاوازتـر و کـۆڵەوارتر و هەژارترە.

هەروەهـا مـرۆڤ لە ڕووی "مـن"ەکەیەوە، خـاوەنی ویسـت و ئیختیـارێکە وەکــو تــاڵەموویەك وایە و، توانــاکەی هێنــدەی گەردیــلەیەکە و، تەمەنی بە ئەندازەی خولەکێکە و، بوونەکەیشـی بەشـێکی یەکجـار هەنـدەکییە لە نێـوان چەندین جۆری لەژمارەبەدەری چەندەها چینی بێسنووردا..

بەڵام لە ڕووی دەستەوســانی و هەژاریــیەکەیەوە، خــاوەنی فــراوانییەکی یەکجار گەورەیە، چونکە "دەستەوسانی"یەکی مەزنی نەبـڕاوە و "هەژاری"یەکی

گەورەی بێکۆتایی هەیە، کە بەهۆیانەوە دەتوانێت ببێـتە ئـاوێنەیەکی فـراوان بـۆ درەوشانەوەکانی خاوەن "توانست"ی نەبڕاوە و "دەوڵەمەندی"ی بێکۆتایی.

هەروەها مرۆڤ لە ڕووی ژیانی دنیایی ماددیی زیندەوەرییەوە، وەکو نـاوکە تۆوێك وایە؛ هەموو ئەو ئامێرانەی کە بۆ ئەوە پێی بەخشراون گوڵ بگرن و بـبن بە درەخت لە پانتایی جیهانی بۆشاییدا، دەچـێ بـۆ هێنـانی چەنـد مـاددەیەکی لاوازی ناو تەنگەبەریی گڵ بەکاریان دەهێنێت، هەتا لە ئەنجامدا بە بێ سـوود دەڕزێن و لەناودەچن.. کەچی لە ڕووی ژیانی مەعنەوییەوە، وەکـو درەختـێکی باقی وایە کە پەلی ئاواتەکانی بەرەو هەتاهەتایی هاویشتووە.

هەروەها مرۆڤ لە ڕووی کار و تێکۆشانی ماددییەوە، زیندەوەرێکی لاواز و دەستەوسانە و، بازنەیەکی هێندە تەسکی هەیە کە نیـوەتیرەکەی تـا ئەو شـوێنەیە دەستی دەیگاتێ..

بەڵام لە ڕووی پاڕانەوەوە و داوا و کـارتێکراوییەوە، میـوانێکی ئـازیزی ئەو میهرەبانەیە کە دەرگای گەنجینەکانی میهرەبانیی بۆ خسـتووەتە سـەر پشـت و، سنعەتە ناوازەکانی خۆی بۆ ژێربار خستووە، ئیتر لەم ڕووەوە بـازنەیەکی هێنـدە مەزنی هەیە کە نیـوەتیرەکەی هێنـدەی مەودای بینینـیەتی، تەنـانەت هەتـا ئەو شوێنەیە کە ئەندێشەی دەیگاتێ، بگرە لەوە فراوانتریشە.

هەروەها مرۆڤ لەو ڕووەی ژیانیەوە کە زیندەوەرێکە و، لە ڕووی کەمـاڵ و سەلامەتی و توندوتۆڵیی ئەو ژیانەوە، سـەد پـلە لە خـوار پـلەی چـۆلەکەوەیە، بەهۆی لێڵبوونی تام و چێژەکانی ئەم مرۆڤە بە خەفەتەکـانی "ڕابـوردوو"ی و بە مەترسییەکانی "داهاتوو"ی..

بەڵام لە ڕووی کۆئەنـــدامەکانی و، جیـــابوونەوەی هەســـتەوەرەکانی و، جۆراوجـۆریی هەسـتەکانی و، کـرانەوەی ئامێرەکـانی و، زۆربـوونی پلەکـانی

لێهاتنیەوە، کە ئەم حاڵەش ئاماژە بۆ ئەرکە بنەڕەتیەکەی ئەو دەکەن کە بینینی تەسبیحاتی بوونەوەرانە و شایەتیدانە لەسەری و، پشکنین و بینینە بە چاوی بیرکردنەوە و پەند و، پاڕانەوەیە بۆ پێویستی و، بەندایەتییە بە پەیبردن و ناسینی دەستەوسانی و هەژاری و ناتەواویی خۆی.. هەروەها لە ڕووی کۆگیریی توانا و لێهاتنەکانیەوە کە ئامادەیی ئەنجامدانی هەموو جۆرە پەرستنەکانی تێدایە..

پلەی مرۆڤ لەم ڕوانەوە، سەد هێندەی پلە بەرزترینی چۆلەکەکان بڵند و بەرزترە..

جا کەسێ کە خاوەنی ژیری بێت، بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی تێدەگات کە ئەم ئامێرانەی بۆ ئەم ژیانە پێ نەدراوە، بەڵکو لە پێناوی ژیانێکی نەبڕاوەی هەمیشەییدایە..

بۆ نموونە: ئەگەر کەسێکمان بینی "دە" دیناری دا بە خزمەتکارێکی بۆ ئەوەی پۆشاکێکی لە پارچەیەکی تایبەتی بۆ خۆی پێ بکڕێ، ئەویش پۆشاکێکی باشی پێ کڕی. پاشان "هەزار" دیناری دا بە خزمەتگوزارێکی دیکەی تاکو شتی پێ بکڕێت، ئەوا بە دڵنیایی دەزانین کە ئەم بڕە پارە زۆرە بۆ کڕینی پۆشاکێك نییە کە نرخی هەرە گرانەکەی تەنها دە دینارە، بەڵکو بۆ شتێکی سەد هێندەی ئەوە بەرز و بەنرختر پێی دراوە..

جا ئەگەر خزمەتکاری دووهەم، بە گەلحۆیی خۆی، بەو هەزار دینارە پۆشاکێکی کڕی کە سەد پلە لە خوار پۆشاکی یەکەمەوە بوو، دەبێ سزایەکی درێژخایەن بدرێ و بە توندی تەمێ بکرێ.

مرۆڤیش بە هێزی "لاوازی"یەکەی و توانستی "دەستەوسانی"یەکەی، بە چەندین پلە، بەهێز و تواناترە. چونکە بە پاڕانەوە و داوای یارمەتی، هێندە کاری

بۆ ئاسان دەکرێت کە بە توانینی خودی خـۆی دەسـەڵاتی بەسـەر یەك لە دەی دەیەکیدا ناشکێت.

مـرۆڤ لەمەدا وەکـو منـاڵ وایە کە بە گریـانەکەی هێنـدە شـت بەدەسـت دەهێنێت کە بە هەزاران هێندەی تواناى خۆی بەدەستی ناهێنێت.

واتە بە "ڕامکردن"ی کارەکان بۆی، سەرکەوتن بەدەسـت دەهێنێـت، نەك بە زاڵبوون و داگیرکردن و ڕاکێشان.

کەواتە دەبـێ بە داوای یـارمەتی لە خـوای گەورە و، لالانەوە لێـی و، بەنـدایەتی بـۆکردنی، دەستەوسـانی و لاوازی و نەبـوونی و هەژاریـی خـۆی، ڕابگەیەنێت.

هەروەهـا مـرۆڤ لە ڕووی "چـاودێری"ی بـۆ لایەنە جوانەکـانی کەمـاڵی دەستەڵاتی پەروەردگارێتی و، "ڕێنماییکردن"ی خاوەن هەستەکان سـەبارەت بە درەوشانەوە ناوازەکانی ناوە خاوێنەکان و، "تێگەیشـتن"ی لە ڕێـی تامچەشـتنی شتە پاشەکەوتکراوەکانی ناو گەنجینەکانی میهرەبـانی و، "زانـین"ی لە ڕێـی سـەنگ و تەرازووودانی گەوهەرەکـانی نـاو گەنجیـنەی نـاوە درەوشـاوەکان و، "بیرکردنەوە"ی لە ڕێی خوێندنەوەی نووسراوەکانی قەڵەمی توانست و، "حەز و شەوق"یشی بەهۆی بینینی بەدیهاتووە ناسکۆڵەکانەوە..

مرۆڤ لەم ڕووانەوە، بەڕێزترینی بوونەوەرانە و جێنشینی خـوای گەورەیە لە زەویدا.

* * *

# وانەی دەهەم[1]

سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی گەوهەرێکی گەنجینەی ئایەتی پیرۆزی:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ والإنْسَ إلاّ لِيَـعْبُـدُونِ﴾ (الذاريات: ٥٦).

ئەی ئەو سـەعیدەی کە خـۆی و ئەرکی سەرشـانی ژیـانی خـۆی لەبیـر بردووەتەوە و، لە حیکمەتی بەدیهێنانی مرۆڤ بێئاگایە و، ئەو شتانەش نازانێـت کە کردگاری دانا لەناو ئەم بەدیهاتووە ڕازاوانەدا دایناون!

**بزانە کە:**

بنیاتنانی ئەم جیهانە و دانانی مرۆڤ تیایدا، وەکو کاری پادشایەکە چەنـدین گەنجیـنەی هەبێـت پـڕ بـن لە گەوهەرە جۆراوجۆرەکـان و، جـگە لەوانە، گەنجینەی پەنهانی دیکەشی ببێت.

هەروەهـا لە دروسـتکردنی شـتی نـامۆدا کـارامە بێـت و، شـتە سـەیر و سەمەرەکانی هونەر و زانستە بێسنوورەکان شارەزا بێت..

ئەم پادشایە، ویستی لە پێش چاوی بینەراندا سام و شکۆی پادشاییەکەی و، بریسکە و درەوشاوەیی سامانەکەی و، شـتانی دەراسـای سـنعەتەکەی و لایەنە نامۆکانی زانیاریی خۆی، دەربخات.

---

(١) دانەر وانەی دەهەمی بەم شـێوە پوختەی ئێرە لە "مەسـنەویی نووری"دا ل: (٦٠٠-٦٠٧) داڕشتووەتەوە. بە فراوانتریش لە "وتەی یازدەهەم"دا درێـژەی بە نـاوەرۆکەکەی داوە. بـڕوانە: (وتەکان) ل: ١٧٢-١٨٦؛ هەروەها کتێبی (من.. خودیی مـرۆڤ و بزووتنـی گەردیلەکـان لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا) ل: ٧٧-١٠٠. (وەرگێڕ)

واتە ویستی لە دوو ڕووەوە: بە بینینی خۆی و، بینینی جگە لە خۆیشی، کەماڵ و جوانی و شکۆمەندیی مەعنەویی خۆی ببینێت.

بۆ ئەم مەبەستە، کۆشکێکی پڕ لە ژوور و نهۆمی بنیات نا و، بە گەوهەرە نەخشینەکانی ناو گەنجینەکانی، ئەو کۆشکەی ڕازاندەوە و، بە ئارایشتی وردەکارییەکانی سنعەتەکەی نەخشاندی و، بە لایەنە وردەکانی هونەرەکانی دانستەکەی ڕێکی خست و، بە موعجیزاتی ئاسەواری زانستەکانیشی نیشانەی کرد و، ئنجا خوانێکی تێدا ڕاخست کە شتانی نەرمونیان و بەلەزەت و نیعمەتەکانی خۆی لەسەر دانا..

هەر بەم جۆرە، هەموو ئەو شتانەی تێدا ئامادەکرد کە بەوان و بە هاوشێوەیان لایەنە پەنهانەکانی کەماڵی پادشا دەربکەوێت..

ئنجا هاوولاتیانی خۆی بۆ گەشت و گەڕان بە ناو ئەم کۆشکەدا بانگهێشت کرد و، میوانداریيەکی ئەوتۆی بۆ سازکردن کە هاوشێوەی نەبوو، وەك بلێی هەموو پارووییەکی خواردەمەنییەکانی نموونەی سەدان سنعەتی ناسك و جوان بن..

پاشان مامۆستایەکی دەستنیشان کرد بۆ ناساندنی شتانی ناو کۆشك (بە میوانەکان)، لە هێماکانی ئەو نەخشانە و، ئاماژەکانی ئەو سنعەتانە و، چۆنێتی ڕووەکانی بەڵگەبوونی نەخشێنراوە ڕێکەکان و گەوهەرە بە تەرازووکاری دانراوەکان لەسەر لایەنەکانی کەماڵی خاوەنەکەیان و، بۆ ئەوەش خەڵکی فێری ڕەویەی هاتنە ناوەوەی کۆشك و چۆنێتیی مامەڵە لەگەڵ خاوەنی کۆشکدا، بکات. پێی دەوتن:

خەڵکینە!

پادشاکەم، بە پیشاندانی ئەو شتانەی کە لەم کۆشکەدان، خۆیتان پێ دەناسێنێت. دەسا ئێوەیش بیناسن..

بەم ئارایشتکاریيانە، خۆی لای ئێـوە خۆشەویسـت دەکـات، دە ئێـوەش بە قەدرزانیتان بۆیان، خۆتانی لە لا خۆشەویست بکەن.

بەم چاکەکاریيـانە خۆشەویسـتیی خۆیتـان بـۆ دەردەبڕێـت، دە ئێـوەیش خۆشتان بوێت..

بەزەیی پێتاندا دێتەوە. دە ئێوەش سوپاسی بکەن.

خۆیتان بۆ دەردەخات. دەسا ئێوەش تاسەمەندی بینینی بن.

ئیـتر ئەم مامۆسـتایە، ئەم ڕوونکـردنەوانە و هاوشـێوەکانی پـێ دەوتـن، کە شایانی کەسێکی وەکو ئەوە بەوانەی بڵێت دەهاتنە ناو کۆشکەکەوە.

ئنجا خەڵکەکە هاتنە ناوەوە و، بوونە دوو بەش:

**بەشێکیان**، سەیری ناو کۆشکەکەیان کرد و، وتیان:

ئەم کۆشکە ئامانجێکی گەورەی تێدایە. ئنجا سەیری مامۆستاکەیان کرد و، وتیان: سڵاوت لێ بێت! کۆشکی لەم جۆرە پێویستی بە کەسێکی وەکـو تـۆیە. دە فەرموو لەو شـتانەمان فێـر بـکە کە سـەروەرەکەت فێـری کردوویـت. ئیـتر گوتاری ئاراستە کردن و، ئەوانیش گوێبیستی بـوون و، سـوودیان وەرگـرت و، ئنجا بە پێی ڕەزامەندییەکانی پادشا ڕەفتاریان کرد.

پاشان پادشا بانگهێشتی کردن بۆ کۆشکێکی هێندە تایبەتی کە لە باسـکردن نایەت، لەوێ بە جۆرە میهرەبانییەك ڕێزی لێنان کە شایانی کەسـێکی وەکـو ئەو بێت بۆ هاوشێوەی ئەوان لە کۆشکی لەو شێوەیەدا..

**دەستەی دووهەم:**

جگە لە خۆراکەکان ئاوڕیان لە شتێکی دیکە نەدایەوە و، خۆیان کەڕ و نابینا کرد و، بە وێنەی ئـاژەڵ بەربـوونە خـواردنەکان و، خـۆیان وەکـو نووسـتوو لێکرد و، لەو شـتانەشـیان خواردەوە کە هـی خـواردنەوە نـین، هەتـا مەسـت

بوون و، زەڕەی دەنگیان سەری لە بینەران شێواند. بۆیە سەربازانی پادشا دەستگیریان کردن و فڕێیان دانە ناو بەندیخانەیەکەوە شایانیان بێت.

تۆ دەزانیت کە پادشا کاتێ ئەم کۆشکەی بۆ ئەم ئامانجانە بنیات نا و، هاتنەدیی ئەم ئامانجانەش بەندە بە بوونی ئەم مامۆستایە و، گوێگرتنی خەڵکیش لێی.. ئەوا ڕاستییە گەر بوترێ:

"ئەگەر ئەم مامۆستایە نەبووایە، پادشا ئەم کۆشکەی دروست نەدەکرد و، گەر ئەو خەڵکەش گوێبیستی مامۆستا نەبن، پادشا کۆشکەکە دەڕووخێنێت و، دەیگۆڕێت بە هی تر".

جا ئەگەر پەیت بە نهێنیی ئەم چیرۆکە نموونەییە بردووە، ئەوا سەیری ڕووە ڕاستەقینەکەی بکە:

ئەو کۆشکە؛ ئەم جیهانەیە کە بنمیچەکەی بە چەندین چرای خەندان ڕووناك کراوەتەوە و، ڕایەخەکەشی بە گوڵزاری ڕازاوە ئارایشت دراوە..

پادشاکەش؛ پادشای ئەزەل و ئەبەدە کە:

﴿تُسَبِّحُ لَهُ السَّمٰوٰتُ السَّبْعُ والأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وإنْ مِنْ شَيْءٍ إلّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ (الإسراء: ٤٤).

﴿اللّٰهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمٰوٰاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوىٰ عَلىٰ العَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّراتٍ بِأَمْرِهِ﴾ (الأعراف: ٥٤).

نهۆم و ژوورەکانیش؛ ئەو جیهانانەن کە هەریەکەیان بەوەی لەگەڵیدا بگونجێت ڕازێنراوەتەوە..

سنعەتە نامۆکان؛ موعجیزاتی توانستی ئەو خوایەن..

خۆراکەکانیش؛ بەروبوومە دەراساکانی میهرەبانیی ئەون..

مەتبەخ و تەنوورەکە؛ زەوی و سەر ڕووی زەوییە.

گەنجینە پەنهانەکان و گەوهەرەکانی ناویان؛ ناوە خاوێنەکان و درەوشانەوەیانن..

نەخشەکان و هێماکانیان؛ سنعەتە هۆنراوەکانیەتی کە هێمایان تێدایە و، بەڵگەکانی ئەوانیشە لەسەر ناوەکانی نیگارکێشیان..

مامۆستاکە و هاوەڵەکانی و قوتابیانی؛ سەروەرمان حەزرەتی محەممەد و سەرجەم پێغەمبەران - درودیان لەسەر بێت - و ئەولیاکانن، خوایان لێ ڕازی بێت..

دەست و پێوەندەکانی پادشایش لە ناو کۆشکەکەدا؛ مەلائیکەتانن، درودیان لەسەر بێت.

میوانە بانگهێشت کراوەکانیش بۆ گەشت و میوانداری؛ مرۆڤ و زیندەوەرانی دەوروبەریەتی.

دوو دەستە و تاقمەکەش؛ یەکەمیان ئەهلی ئیمان و شوێنکەوتووانی ئەو قورئانەن کە واتاکانی کتێبی بوونەوەرانیان بۆ ڕاڤە دەکات.. دەستەکەی تر؛ ئەهلی کوفر و یاخیبووانن، کە شوێنکەوتەی دەروون و شەیتانن و، کەڕ و لاڵ و نابینان:

﴿كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلاً﴾ (الفرقان: ٤٤)..

ئەوانە جگە لە ژیانی دنیا لە هیچ شتێکی تر تێناگەن..

جا ئەوانەیان کە چاکەکار و بەختەوەر بوون، بوونە گوێبیستی ئەو بەندەیەی کە بە "الجوشن الكبير" وەسفی پەروەردگاری دەکات و، ئەو ڕاگەیەنەرەی کە ڕێنماکاری خەڵکە بۆلای قورئانی پیرۆز..

ئیتر گوێیان لە قورئان گرت و، بوونە بینەری لایەنە جوانییەکانی دەستەڵاتدارێتیی پەروەردگاری، بۆیە تەکبیر و تەسبیحاتیان پێشکەش کرد..

پاشان خۆیان بوونە ناسێنەری درەوشانەوە ناوازەکانی ناوە خاوێنەکان، ئیتر تەسبیح و ستایشیان پێشکەش کرد..

بە سروشت و هەستەوەرەکانیان لە پاشەکەوتکراوەکانی گەنجینەکانی میهرەبانی تێگەیشتن، بۆیە ستایش و سوپاسیان ڕاگەیاند..

پاشان بە تەرازووی کۆئەندامەکانیان بوونە زانای گەوهەری ناو گەنجینەی ئەو ناوانەی کە بە تەرازووی ورد درەوشاونەتەوە، بۆیە تەقدیس و ستایشیان پێشکەش کرد..

پاشان بوونە خوێنەری نووسینەکانی قەڵەمی توانست، ئیتر بە تێفکرینەوە نرخیان زانی..

پاشان بە بینینی وردەکارییەکانی بەدیهێنان بوونە سەیرانکەری ناو کۆشك، ئیتر بە تاسەمەندییەوە بەدیهێنەریان خۆشویست..

پاشان لە بەرامبەر خۆناساندنی کردگارەوە بە موعجیزاتی سنعەتەکەی، زانینی ئاوێتەی سەرسامییان دەربڕی و، وتیان:

"سُبْحانَكَ ما عَرَفْناكَ حَقَّ مَعْرِفَتِكَ، يا مَعْرُوفُ بِمُعْجِزاتِ جَميعِ مَصْنُوعاتِكَ"!

پاشان لە بەرامبەر خۆ خۆشەویستکردنی، لە ڕێی بەروبوومە ڕازاوەکانی میهرەبانییەکەیەوە، ئەمان خۆشەویستییان بۆ نواند..

پاشان لە بەرامبەر سۆز و چاودێریی بۆیان، لە ڕێی نیعمەتە بە تام و چێژەکانیەوە، ستایش و سوپاسیان پێشکەش کرد و، وتیان:

"سُبْحانَكَ ما شَكَرْناكَ حَقَّ شُكْرِكَ، يا مَشْكُورُ بِأَثْنِيَةِ جَميعِ إِحْساناتِكَ عَلىٰ رُؤُوسِ الأَشْهادِ، وبِإِعْلاناتِ جَميعِ نِعَمِكَ ولَذائِذِها في سُوقِ الْكائِناتِ، وبِشَهاداتِ نَشائِدِ مَنْظُوماتِ جميعِ ثَمَراتِ رَحْمَتِكَ وَنِعْمَتِكَ لَدَىٰ أَنْظارِ الْمَخْلُوقاتِ"!

پاشان لە بەرامبەر دەرخستنی گەورەیی و کەماڵ و جوانی و شکۆمەندیی ئەو زاتە لە ئاوێنە کاتی و بەخورەکانی بوونەوەراندا، ئەمان سوژدەیەکیان بۆ برد کە ئاوێتەی خۆشەویستییە لە ناو سەرسامیی و دووتوێی توانەوەدا..

پاشان لە بەرامبەر پیشاندانی فراوانیی میهرەبانیی و زۆریی سامانەکەیەوە، ئەمان هەژاری و داواکارییان دەربڕی..

پاشان لە بەرامبەر ڕاگەیاندنی وردەکارییەکانی سنعەتەکەیەوە، ئەمان بە ڕێز و، نرخزانی و، بینین و، شایەتیدان و شایەتی لەسەرکردن ڕووبەڕووی بوونەوە.. لە بەرامبەر ئەوەی کە ئەو زاتە دەستەڵاتی پەروەردگارێتییەکەی خۆی لە هەموو گۆشە و کەنارێکی بوونەوەراندا ڕاگەیاند، ئەمان تەوحید و گوێڕایەڵییان نواند، لە ڕێی ئەوەی کە لاوازی و دەستکورتییان لە توێی هەژارییەکەیاندا ڕاگەیاند.

ئیتر ئەو دەستەیە لەم خانەیەدا بە ڕادەیەکی وا ئەرکی بەندایەتییان جێبەجێ کرد کە شێوەی جوانترینی بەدیهاتووانیان وەرگرت و، لە بەدیهاتنی هەموویان بڵندتر و، جێنشینێکی بێ وەی و، دەستپاك و خاوەن پیت و ئیماندار.

پاش ئەوە، پەروەردگاریان بۆ خانەی ئاسوودەیی بانگهێشتی کردن، بە مەبەستی پێ بەخشینی بەختەوەریی هەمیشەیی..

ئیتر لەوێ بە شتانێك ڕێزی لێ نان کە نە هیچ چاوێك بینیونی و، نە هیچ گوێیەك بیستوونی و، نە بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا هاتوون.

سەبارەت بە دەستە و تاقمەکەی تر:

کافربوونیان هەڵبژارد، بەو کافربوونەش سووکایەتییان بە هەموو بوونەوەران کرد، بەهۆی ئەوەی - وەك ڕابورد - نرخ و بەهای ئەوانیان هێنایە خوارەوە و، دەستیان بە ڕووی هەموو درەوشانەوەکانی ناوە جوانەکانەوە نا. بەوەش تاوانێکی ناکۆتایان ئەنجام دا. بۆیە شایانی سزایەکی ناکۆتا بوون.

دەسا ئەی سەعیدی هەژار!

ئایـا پێـت وایە كە ئەركی سەرشـانی ژیانـت، جوانپاراسـتنی دەروون و، پەروەردەی شارستانی و، خزمەتی نیشتمان و، هەوا و هەوەسەكانە؟

یـان پێـت وایە كـە دانـانی ئەم هەمـوو هەسـت و هەسـتەوەر و پەل و كۆئەندام و ئامێر و ئەنـدام و لایەنە ناسـك و مەعنەوییـانە لە مەكینەی ژیـانی تۆدا، لەبەر ئەوە بێت كە لە هەوەسە نزمەكانی دەروون و لەم ژیانە فانییەدا بەكار بهێنرێت؟

نەخێر.. وا نییە..

بەڵكو حیكمەتی دانانی هەموو ئەوانە لە بەدیهاتنی تـۆدا تەنهـا لەبەر ئەوەیە كە هەست بە سەرجەم جۆرەكانی نیعمەتەكانی خوای گەورە بكەیـت و، تـامی زۆربەی بەشەكانی درەوشانەوەی ناوەكانی ئەو بچێژیت.

ئامانجی دانانی ئەوانە لە تۆدا تەنها ئەوەیە كە:

بەو پێوەرانە، پاشەكەوتكراوانی گەنجینەكانی میهرەبانیی ئەو بكێشیت و..

بەو ئامێرانەش گەنجینە پەنهانەكانی درەوشانەوەی ناوەكانی خواوەند - جَلَّ جَلالُـهُ - بكەیـتەوە؛ تەنـانەت ئامانجەكـانی ژیانـت تەنهـا دەرخسـتن و ئاشكراكردنی شتە نامۆكـانی درەوشـانەوەی ناوەكـانە لە ژیـانی تـۆدا لە نێـوان برایانی بوونەوەرانتدا..

پاشـان ڕاگەیانـدنی بەنـدایەتیتە بە زمـانی حـاڵ و گوفتـار لە دەرگـانەی پەروەردگارێتیی ئەودا..

پاشان خۆڕازاندنەوەتە لە پێش چاوی بینینـی بینـەری ئەزەلیـدا بە گەوهەرە نەخشاوەكانی درەوشانەوەی ناوەكانی ئەو..

پاشان تێگەیشتنتە لە سڵاوكردنی زینـدەوەران، لە ڕێـی تەسـبیحاتیانەوە، لە بەخشەری ژیان و، بینینی تەسبیحاتیانە لە لایەن تۆوە و، شـایەتیدانت پێیـان و، شایەت گرتنت لەسەریان..

پاشان تێگەیشتنتە بە پێوەری جوزئی بوونی سیفەتەکانت و کاروبارەکانت، لە سیفەتەکانی بەدیهێنەرت و کاروبارە ڕەها و پیرۆز و خاوێنەکانی..

پاشان تێگەیشتنە لە وشەکانی ئەو بوونەوەرانەی کە زمانیان گۆیای تەوحید و پەروەردگارێتیی ئەوە..

پاشان پەیبردنتە، لە ڕێی هاوشێوەی دەستەوسانی و هەژاریتەوە، بە پلەکانی درەوشانەوەی توانست و دەوڵەمەندیی ئەو.

چییەتی و کاکڵەی ژیانیشت، تەنها بریتییە لە گەنجینە و نەخشە و نموونە و پوختە و پێوەر و کێشەر و پێرستێك، بۆ ئاسەوارە نامۆکانی درەوشانەوەی ناوەکانی بەدیهێنەری ژیان و مردن.

شێوەی ژیانیشت، بریتییە لە وشەیەکی نووسراوی بیستراوی تێگەیەنەر لە ناوە جوانەکانی ئەو..

حەقیقەتی ژیانیشت، بوونیەتی بە ئاوێنە بۆ درەوشانەوەی "ئەحەدییەت"..

کەماڵی ژیانیشت لە بەختەوەربوونیدا، تەنها بەوە دەبێت کە هەست بەو خۆشەویستی و شەوق و تاسەیە بکات کە لەودا دەرکەوتووە و ئەم بووەتە ئاوێنەیان.

زیندەوەرانی تر لە هەندێکی ئەم ئامانجە باسکراوانەدا بەشداریت دەکەن. بەڵام لەگەڵ تۆدا یەکسان نین، چونکە هەر تەنیا تۆی کە ئاوێنەی لەخۆدا کۆکەرەوەی سەرجەمی ئەو ئامانجانەیت، وەك ڕیوایەت کراوە:

"ما يَسَعُني أرْضٌ ولا سَماءٌ ويَسَعُني قَلْبُ عَبدي الْمُؤْمِن"[١].

* * *

(١) واتای ئەم حەدیسە قودسیەیە کە دەفەرموێ: (إنَّ السمٰواتِ والأرضَ ضَعُفْن أنْ يسَعْنَني، ووسَعَني قلبُ عبدي المؤمنِ الوادعِ اللّين). ئیمامی سیوطی دەفەرموێ: "أخرجه الإمام أحمد في الزهد عن وهب بن منبه". بڕوانە: "الدرر المنتثرة" ص١٣٩-١٤٠. (وەرگێڕ)

# وانەی یازدەهەم[1]

﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ ۞ وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ ۞ وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ۞ إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ ۞ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۞ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۞ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ ۞ وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ ۞ وكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ ۞ فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ﴾ (الليل: ١-١٠).

ئەی ئەوروپا[2]!

**بزانە کە:** تۆ بە دەستی ڕاستت فەلسەفەی ڕێ ونکەری دەردەدار و، بە دەستی چەپیشت شارستانێتیی زیانبەخش و نەفامت هەڵگرتووە و، لافی ئەوەش لێ دەدەیت کە گوایا "بەختەوەریی مرۆڤ لەو دوانەدایە"!

دەك دەستت بشکێت بۆ ئەو دیارییە بێکەڵکەی پێشکەشی مرۆڤایەتیی دەکەیت!

---

(١) دانەر وانەی یازدەهەمی بەم شێوەیەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٤١٢-٤٢٠) داڕشتووەتەوە. لە "بریسکەی حەڤدەهەم"یشدا بە فراوانتر ناوەرۆکەکەی هێناوە. بڕوانە: (بریسکەکان) ل: ٢٢٨-٢٤٠؛ (ڕاستییەکانی ئیمان) ل: ٦٣-٨٠. (وەرگێڕ)

(٢) "ئەوروپا" دوو ئەوروپایە؛ **یەکەمیان:** بەهۆی کەڵك وەرگرتنی لە ئایینی عیسایی و شارستانێتیی ئیسلام و، بە چاکەی خوای گەورە، هێندە سوودی بە مرۆڤایەتی گەیاند کە لەم ژیانەدا پێی بحەوێتەوە. **بەڵام ئەوروپای دووهەم،** دژایەتیی ئایینەکانی ئاسمانی کرد و، پشتی بە فەلسەفەی سروشتیی ماددی بەست و، خراپکارییەکانی شارستانێتی بەسەر چاکەکارییەکانیدا زاڵ بوو، هەروەك بوو بە هۆی گرفت و بەدبەختیی زۆرینەی مرۆڤایەتی. جا من لەم گوفتارەمدا ڕووی دەمم لەم بەشەی دووهەمی ئەوروپایە. (دانەر)

ئەی برەودەر بە کوفر و بڵاوکەرەوەی ئینکاری!

گەر کەسێك دڵ و ژیری و ویژدان و گیانی بە تیری چەندین گرفتی مەزن پێکرابێت، ئایا دەگونجێ بەختەوەریی دەست کەوتبێت تەنها بەوەی کە جەستەی لە لوتکەی خۆشگوزەرانی و ئارایشتدا بێت؟

ئایا نابینیت کە ئەگەر مرۆڤێك دڵی ئەندێشەی شکابێت و، لە هیوا و ئاواتێکی "وەهمی" نائومێد بووبێت و، لە هاتنەدیی کارێکی هەندەکی دەستی داشتبێت، چۆن شیرینی لێ تاڵ دەبێت و، سازگاری بەتامی بۆ دەبێتە ئازار و، دنیای لێ دێتەوە یەك؟

ئەی ئایا ئەو کەسەی کە بەهۆی شوومیی تۆوە، ناخی دڵ و گیانی (بە هەتیوکەوتنی ڕۆحی و، بە دووچاربوونی بەو گومڕاییە) پێکرابێت، کە هەموو هیوا و ئاواتێکی دەبڕێت و ئازارەکانی دەهێنێتەوە سۆ، دەبێ حاڵی چۆن بێت؟

گەر کەسێك "دڵ" و "گیان"ی لە دۆزەخدا بن و، جەستەشی لەناو بەهەشتێکی درۆینەی لەناوچوودا بێت، ئایا دەکرێ پێی بوترێت "بەختەوەر"؟

دەسا ئەی ئەو گیانە خراپکارە!

گوێبیستی ئەوە بە کە بۆت باس دەکرێت:

وا لە نێوان هەزارانی ئەو ڕێگا لەناوبەرانەی کە تۆ مرۆڤت پێ دووچار کردوون، تەنها یەك دانەیت بۆ باس دەکەم و، بۆ ڕوونکردنەوەشی لە پێشدا نموونەیەك دەهێنم:

بۆ نموونە: لێرەدا دوو ڕێگا هەن..

وا ئەم ڕێگایەمان گرتەبەر..

بە درێژایی ماوەی گەشتەکەمان و هەتا ئەو شوێنەی چاو دەیبینێت و، لە هەموو هەنگاوێکدا، کەسێکی بێ دەسەڵات دەبینین کە خەڵکانی خۆسەپێن هێرشی بۆ دەبەن و، سامان و ئاژەڵەکانی زەوت دەکەن و، خانووبەرەی بەسەردا دەڕووخێنن، تەنانەت هەندێ جاریش بە ڕادەیەك جەستەی زامدار دەکەن کە

ئاسمانیش بۆی دەگری! چاو بە هەر لایەکدا دەگێڕین هەمان حاڵ و بارودۆخ دەبینین.. ئیتر لەم ڕێیەدا و بەم جۆرە، جگە لە قڕە و غەڵبەی ستەمکاران و، شیوەن و گریانی ستەملێکراوان هیچی تر نابیستیت و، ماتەمینگایەکی گشتی سەرانسەری ئەم ڕێیەی داپۆشیوە!

جا لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە ئازاری کەسانی تر ئازار دەچێژێت، لەولاشەوە ویژدانی مرۆڤ هەڵگرتنی ئازاری تا ئەم ڕادەیەی لە توانادا نییە. ئەوا ئەو کەسەی کە ئەم دیمەنە دەبینێت، ناچار دەبێت خۆی لە مرۆڤێتی دابماڵێت و، ئەوپەڕی دڕندەیی لەخۆ بگرێت بەوەی کە ببێتە هەڵگری دڵێکی هێندە بێ بەزەیی کە مادەم خۆی بێ وەی بێت گوێ بە تیاچوونی خەڵکانی تر نەدات.

دەسا ئەی ئەورووپا!

تۆ هاتی بە "فێڵبازیی یەك چاوەت" ئەم حاڵەتە دۆزەخ ئاسایەت بە گیانی مرۆڤ بەخشی. پاشان بۆ چارەسەری ئەم دەردە سەختەش دەرمانێکت دۆزییەوە کە بە تەواوی هەست و نەستی ئادەمیزاد لەکار دەخات و، بریتییە لە گەمە و لەهوە سەرنج ڕاکێشەکانت.

دەك بەدبەختی و چارەشوومی هەر چارەنووسی خۆت و دەرمانت بێت!

پاشان بە ڕێی دووهەمدا ڕۆشتین..

لە هەموو مەنزڵگا و شوێن و شارێکی سەر ئەم ڕێیەدا چەندین سەربازی کارمەند دەبینین کە بە هەموو ڕێ و بان و ئاسۆیەکدا بڵاوبوونەتەوە. ئنجا هەندێ فەرمانبەر دێن، حەوانەوە بە هەندێ لەو سەربازانە دەبەخشن و، چەك و وڵاخ و کەرەسەی سەربازیی سەر بە دەوڵەتیان لێ وەردەگرنەوە و، "بلیتی ڕوخسەت"یان دەدەنێ. ئەو سەربازانەش، بەم حەوانەوە و لەسەر کار لابردنە و بە گەڕانەوەیان لە ناوەرۆکدا بۆ لای پادشا، گەلێ شاد و دڵخۆشن. هەرچەندەش لە ڕواڵەتدا خەم بۆ دابڕانیان لەو شتانە دەخۆن کە پێیان ڕاهاتبوون.

هەندێ جار ئەو فەرمانبەرانە بە سەربازی وا دەگەن کە لە زمانیان تێناگات و نایانناسێت.. پێیان دەڵێت: "من سەربازی پادشام و لە خزمەتی ئەودا کار دەکەم و لە ئەنجامیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە. جا ئەگەر بە ڕوخسەت و ڕەزامەندیی ئەو هاتوون، ئەوا بەخێربێن سەر سەر و سەر چاوم. دەنا لەسەر ڕێم لاچن، خۆ هەرچەندە من تەنیا کەس و ئێوەش هەزاران بن، لەگەڵتاندا دەجەنگێم، ئەوەش نەك لەبەر خۆم، بەڵکو لە پێناوی پارێزگاریکردنی ئەمانەتی خاوەنەکەم و بۆ مەبەستی پاراستنی ڕێزی عیزەت و دەسەڵاتەکەی".

ئیتر بەم جۆرە و بە درێژایی ڕێی دووهەم و ماوەی گەشتەکەمان، خەڵکانێکی جەمکراو دەبینین کە بەوپەڕی خۆشی و شادمانی و لەگەڵ وتنی: "لا إلٰه إلّا اللّٰه"دا دەکرێن بە سەرباز، لەوانەی کە پێیان دەوترێت: "لەدایکبووان".. هەروەها بە هەمان خۆشی و لەگەڵ وتنی: "اللّٰه أکبر"دا پشوویێدان و تەسریحکردنیش لە سەربازی بەردەوامە، لەوانەی کە پێیان دەوترێت: "کۆچکردووان".

جا قورئانی پیرۆز دیارییەکی ئەوتۆی بە مرۆڤایەتی بەخشی کە ئەگەر شوێنی بکەون، هاوچەشنی ئەم ڕێگایەی پێ دەگرنەبەر..

﴿لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (یونس: ٦٢).

دەسا ئەی ئەوروپا!

تۆ گومان وا دەبەیت کە گوایا هەموو زیندەوەرێك، هەر لە بچووکترین گیانلەبەری وەك ماسی تا دەگاتە مەزنترین مەلائیکەت، خاوەنی خۆیەتی و، تەنها بۆ خۆی و لەپێناوی خۆیدا کار دەکات و تێدەکۆشێت و، مافی ژیانێکی هەیە و، ئەوپەڕی هیممەتی پاراستنی مانەوە و بەردەوامبوونی ژیانیەتی..

هەرچی "هاوکاری" هەیە لە نێوان بەدیهاتوواندا، کە بە فەرمانی بەدیهێنەریان ڕایی دەبێت، چەشنی "یارمەتیدانی ڕووەك بۆ ئاژەڵ و، ئاژەڵیش بۆ مرۆڤ"، تۆ بە "مشتومڕ و ململانێ"یان تێدەگەیت، بە ڕادەیەکی وا کە بڕیار دەدەیت:

"ژیان تێکڕا بریتییە لە مشتومڕ و ململانێ"!

گەلێ سەیرە!

ئایا چۆن ئەو فریاگوزارییەی کە گەردیلەکانی خۆراك بەوپەڕی تاسەمەندی و شادمانییەوە دەیکەن و بەدەم خانۆچکەکانی لەشەوە دەڕۆن و خۆراکیان دەرخوارد دەدەن، بە کاری مشتومڕ و ململانێ دادەنرێت؟!

نەخێر.. ئەو یارمەتیدانە تەنها و تەنها "هاوکاری"یەکە بە فەرمانی پەروەردگارێکی بەخشندە ئەنجام دەدرێت.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە زیندەوەر خاوەنی خۆی نییە، مرۆڤە؛ کە بەرزترین و خاوەنی فراوانترینی ویست و ئیختیارە لە نێوان سەرجەمی هۆکارەکاندا.. کەچی لەنێو دەستی ویست و ئیختیاری و بازنەی توانای، لە دیارترینی ئەو کردارانەیدا کە بە ویست و ئیختیاری خۆی ئەنجامیان دەدات، وەك خواردن و قسە و بیرکردنەوە، بەشێکی یەك لە سەدیان نەبێت هیچی تریان بە دەستی خۆی نییە!

لە کاتێکدا کە بەرێزترین "هۆکار" و فراوانترین "ویست و ئیختیار" ئاوا دەستی بەسترابێت و، خاوەنی مۆڵکداری و هەڵسوکەوتی ڕاستەقینەی خۆی نەبێت، دەبێ ئاژەڵ و بێگیانەکان چۆن بن؟

تەنها "فێڵبازیی یەك چاوە"تە کە تۆی لەم هەڵەیەوە گلاندووە. چونکە پەروەردگارەکەی خۆی لە یاد چوو کە بەدیهێنەری هەموو شتێکە و، پشتی بە "سروشت"ی وەهمی بەست و، ئاسەوارەکانی دایە پاڵ"هۆکارەکان" و، موڵك و سامانی خوای بەسەر پەرستراوانی جگە لە خوای گەورەدا دابەش کرد..

ئیتر لە حاڵی وادا، مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێك ناچار دەبێت، هەر بە تەنها خۆی، لەگەڵ چەندین دوژمنی لەژمارەبەدەردا بکەوێتە ململانێ بۆ بەدەستهێنانی پێداویستییە لەسنووربەدەرەکانی. ئەوەش تەنها بە تواناکەی خۆی

کە بە ئەندازەی گەردیـلەیەکە و، بە ویســـت و ئیختیاریشـــی کە چەشـنی تـاڵە موویەکە و، بەو هەست و شعوورەشی کە وەکـو بریسـکەیەکی خێـرا یەکسـەر نامێنێـت و، بەو ژیـانەی کە لە بڵێسـەیەك دەچێـت؛ لە پـڕ دەکـوژێتەوە و، لەو تەمەنەشدا کە دەڵێی ماوەکەی یەك خولەکە و کتوپڕ تەواو دەبێت.

لە کاتێکـدا کە هەرچیـیەکی لە دەسـتدایە (لەمـانەی کە بـاس کـران) بەشی هێنـانەدیی تەنیـا یەکێـك لە داواکارییەکـانی ناکـات. خـۆ ئەگەر دووچـاری گیروگرفتێك ببێت، لە چەنـد هۆکـارێکی کەڕ و نابینـا نەبێـت هیـوای بە هـیچ یارمەتییەکی تر نابێت:

﴿وَما دُعاءُ الْكافرينَ إِلاّ في ضَلال﴾ (الرعد: ١٤)!

ئەم فێڵبازی و زیرەکییە ڕەش و تاریکەت، ڕۆژگاری مرۆڤایەتیی گۆڕیـوە بە شەوگارێکی ڕووناکبوو بە چەند چرایەکی درۆینە و گاڵتەجار!

لە بینینی قوتابییەکـانی ئەم فێڵبازییەتـدا، هەمـوو زینـدەوەرێك دووچـاری هێرش و پەلاماری ستەمکاران بووە، بە وێنەی ئەو مـرۆڤە هەژارەی کە لە ڕێـی یەکەمدا بینیمان..

دنیـاش بە ماتەمینگـایەکی گشـتی دەبینێـت و، ئەو دەنگـانەش کە لێـی دەبیسترێن بە هەواڵی مردن و، ناڵە و گریانی هەتیوانی دەزانێت.

قوتابییە تایبەتمەندەکەشی کردووە بە "فیرعەونێك"، بەڵام بێنرخـترین شـت دەپەرستێت و هەر هۆکارێك سوودێکی پێ بگەیەنێت بە پەروەردگـاری خـۆی دادەنێت!

هەر ئەم قوتابییەت، کەسێکی "یاخی"یە، بەڵام یـاخییەکی هێنـدە هەژارە کە لەوپەڕی زەلیلیـدایە بـۆ بەدەسـتهێنانی چێـژ و لەزەتی خـۆی و، لەپێنـاوی سوودێکی نزمی بێنرخدا قاچی شەیتانیش ماچ دەکات!

ئەم قوتابییەت بە زەبروزەنگە، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ پاڵپشتێك شك نابات پشتی پێ ببەستێت، ئەوا لەناخی خۆیدا تابڵێی دەستەوسان و کۆڵەوارە..

ئەوپەڕی هیممەتی قوتابیی تۆ (هەوا و ئارەزووەکانی) سك و فەرجیەتی، یان سوودی گەلەکەی، ئەوەش نەك بۆ گەلەکەی بەڵکو لەبەر سوودی خۆی، یان لەبەر دامرکاندنی سۆزی هاوڕەگەزی، یاخود تێرکردنی هەڵپە و لەخۆبایی بوونی خۆی و، جگە لە خۆی کەسی تری خۆش ناوێت و، لە پێناوی خۆیدا هەموو شتێکی تر بەخت دەکات!

بەڵام قوتابیی بێگەردی قورئان "بەندە"یە. بەڵام بەندەیەکی وا کە دانابەزێتە ئاستی بەندایەتیکردن بۆ مەزنترینی بەدیهاتووان و، سەر نەوی ناکات بۆ مەزنترین سوود و بەرژەوەندی، تەنانەت گەر بەهەشتیش بێت..

ئەم قوتابییەی قورئان "لەسەرخۆ و نەرمونیان"ە، بەڵام جگە لە بەدیهێنەری مەزنی خۆی - مەگەر بە ڕوخسەتی ئەو - لە ڕووی کەسدا زەلیلی نانوێنێت..

هەروەها ئەم قوتابییەی قورئان "هەژار"ە، بەڵام بەو پاداشتەی کە خاوەنە بەخشندەکەی بۆی پاشەکەوت کردووە، بێ نیازە لە هەموو شتێك..

هەروەها "لاواز"ە، بەڵام پاڵی بە هێزی خاوەنە گەورەکەی خۆیەوە داوە، کە توانستی ناکۆتایە.

قوتابیی ڕاستەقینەی قورئان ڕازی نابێت کە تەنانەت بەهەشتی هەمیشەییش ئامانجی بێت، چ جای ئەم دنیا فانییە!

دەسا بۆ خۆت بڕوانە بۆ جیاوازیی پلەی هیممەتی ئەو دوو قوتابییە!

هەروەها قوتابیی قورئان مەزنترین بەدیهاتووی وەك "عەرش" و "خۆر"یش جگە لە بەدیهاتوویەکی دەستەوسان و دەستەمۆ و فەرمانبەردار، بە شتێکی دیکەی نابینێت..

هەروەها لەناو گیانی خۆیدا هەست بە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەگەڵ هەموو کەسە چاکەکانی سەرجەم ئاسمانەکان و زەویدا دەکات، ئیتر لە ناخی دڵیەوە دوعایان بۆ دەکات، بە وێنەی ئەوەی کە دوعا بۆ خانەوادە و کەسوکاری خۆی دەکات.

فەرموو سەیری جیاوازیی مەردایەتیی هەردوو قوتابییەکە بکە:
ئەویـان لە پێنـاوی خۆیـدا لە بـراکەی هەڵـدێت و.. ئەمیـان سـەرجەمی بەندەکانی خوای گەورە بە برای خۆی دەزانێت..

قورئان لە بریـی ئەم تەزبـێحە ئاسـاییە، ژمـارەی گەردیلەکـانی بـوونەوەران دەداتە دەست قوتابیانی تاکو تەسبیحاتی خوای گەورەی پێ بـکەن و، لە بریـی ئەو تەزبـێحەی کە ژمـارەی دەنکەکـانی نەوەد و نـۆیە، زنجیـرەی سـەرجەم گەردیلەکـانی بوونەوەرانیـان لە دەسـتدایە و، وێردەکانیـان بەو تەزبـێحە سەرسـوڕهێنەرە دەخـوێنن و، بەو ژمـارەیە، بەڵکـو زیـاتریش، یـادی پەروەردگاریان دەکەنەوە.

فەرموو سەیری قوتابیانی قورئان بکە لە "ئەولیا و پیاوچاکان"ی وەك شێخی گەیلانی[١] و، ڕەفاعی[٢] و، شازلی[٣] و، ببینە کە چۆن زنجیرەی گەردیلەکان و

(١) شێخ عەبدولقادری گەیلانی (٤٧٠-٥٦١ك): یەکێکە لە گەورە خزمەتگوزارانی ئـایینی ئیسلام، چەنـدەها کەس لە گـاور و جوولەکەکـان لە خزمەتیـدا موسـڵمان بـوون و هەزاران موسڵمانیش لەسەر دەستیدا تۆبەیان کردووە. لە بەرهەمەکانی: (الغنیـة) و (فتـوح الغیـب) و (الفتح الرباني). بڕوانە: رجال الفكر والدعوة في الإسلام، أبو الحسن الندوي؛ هكـذا ظهـر جيل صلاح الدين وهكذا عادت القدس، د. ماجد عرسان الكيلاني. (وەرگێڕ)
(٢) سەیید ئەحمەدی ڕەفاعی؛ ناوی تەواوەتیی: ئەحـمەدی کـوڕی عەلیـی کـوڕی یەحیـای ڕەفاعییە. ساڵی (٥١٢ك) لە گوندێکی سەر بە شاری "واسط"ی عێراق لەدایك بـووە و، هەر لەوێش وانەکانی خوێندووە و، لە ئەدەب و فیقهدا شارەزایی پەیدا کردووە. لە گونـدی "ئـوم عوبەیـدە" لە نێـوان واسـط و بەسرەدا ژیـاوە. سـاڵی (٥٧٨ك) کـۆچی دوایـی کـردووە. پێشەوایەکی زاهید بووە و دامەزرێنەری تەریقەتی ڕەفـاعییە. بڕوانە: الأعـلام ١/١٧٤، جـامع كرامات الأولياء ٢/٤٩٠، نور الأبصـار ٢٢٠، الطبقـات الكـبرى ١/١٤٠، وفيـات الأعيـان ١/٥٥. (وەرگێڕ)
(٣) (شازلی) ناوی: "عەلیی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولجەبار"ە و، لە سـاڵی (٥٩١ك) لە گوندێکی ئەفریقیا بە ناوی "شاذلە" لە دایك بووە. پێشەوایەکی زاهید و شـێخی تەریـقەتی شازلی و دانیشتووی "ئەسکەندەرییە"ی میسـر بووە و، خـاوەنی ئەو کـۆمەڵە وێـردەیە کە بە

ژمارەی دڵۆپە ئاوەکان و هەناسەی بوونەوەران و جگە لەمانەشیان وەك تەزبیح لێ کردووە و، زیکری خوای گەورەی پێ دەکەن! تەنانەت هێشتا ئەو ژمارانەش بە کەم دەزانن و دەست بۆ ژمارە ناکۆتاکانی زانیارییەکانی خواوەندی زانای پەنهانەکانیش درێژ دەکەن (تاکو بەو ژمارانە یادی خوای گەورە بکەن).

بڕوانە بۆ ئەم مرۆڤەی کە بچووکترین میکرۆب زۆرانی لەگەڵ دەگرێت و، کەمترین تەنگانەش تەختی زەویی دەکات، چۆن لە ڕێژنەی ڕێنمایی قورئانەوە بەرز دەبێتەوە و، لایەنە ناسك و نیانەکانیشی فراوانی و بەربڵاوی بەدەست دەهێنن، بە ڕادەیەك کە مەزنترینی بوونەوەرانی دنیای گەلێ پێ بچووکترە لەوەی بیکات بە تەزبێحی ویردەکانی و، بەهەشتی مەزنیشی پێ کەمترە لەوەی کە بیکات بە ئامانجی زیکرەکانی. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گەورەییەك لە خۆیدا نابینێت بەسەر نزمترینی بەدیهاتووانی خوای گەورەدا!

ڕێنمایی قورئان بە مرۆڤ دەڵێت:

ئەی کاکی مرۆڤ!

هەرچی لە دەستی تۆدایە، موڵك و سپاردەی خاوەنێکی بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا و زانا بە هەموو شتێکە. ئەویش سەبارەت بە تۆ بەخشندە و میهرەبانە..

ئەو موڵکەی خۆی - کە بە سپاردە لای تۆ دایناوە - دەکڕێتەوە لێت، تاکو لای تۆ نەفەوتێ و بۆت بپارێزێت. نرخێکی پێشینەی گەلێ گەورەشت لە بریی ئەوەدا دەداتێ، لە کاتێکدا کە تۆ جگە لە سەربازێکی کار پێ سپێرراوی ئەو شتێکی تر نییت..

"حزب الشاذلي" ناسراوە. بڕوانە: الأعلام ٣٠٥/٤، جامع كرامات الأولياء ٣٤١/٢، نور الأبصار ٢٣٤. الطبقات الكبرى ٤/٢. (وەرگێڕ)

کەواتە لەبەر ئەو خاوەنەت و بە ناویەوە کارەکانت جێبەجێ بکە. ئەوەتا هەر ڕۆژییەکت پێویست بێت هەر ئەو دەینێرێت بۆت و، لەو شتانەش دەتپارێزێت کە دەسەڵاتت بەسەریاندا ناشکێت!

ئامانجی ژیانیشت لەوەدایە کە جێی تیا درەوشانەوەی ناوەکان و کاروبارەکانی ئەو بیت.

جا ئەگەر هەر کاتێ گرفتێکت تووش بوو، بڵێ: ﴿إِنَّا لِلَّـهِ﴾ (البقرة: ١٥٦)، واتە ئێمە موڵکی خوای گەورەین و لە خزمەتی ئەودا کار دەکەین. تۆش - ئەی گرفتەکە! - ئەگەر بە ڕوخسەت و ناوی خواوە هاتوویت، بەخێربێیت سەرچاوان! چونکە ئێمە ﴿إِلَيْهِ راجِعُونَ﴾، واتە بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە و تاسەمەندی بینینی ئەوین. خۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان لە دەست ئەرکەکانی ژیان ئازادمان دەکات، دەبا ئێستا ڕزگاربوونمان لەسەر دەستی تۆدا بێت..

بەڵام ئەگەر بە فەرمان و ویستی خوای گەورە و تەنها بۆ ئەوە هاتوویت کە لەسەر دەستی تۆدا تاقی بکرێمەوە، بێ ئەوەی ئەو ڕوخسەتی دابێت و ڕازی بێت ملکەچی تۆ ببم، ئەوا تا دەتوانم سپاردەی خاوەنەکەم دەپارێزم و بە هیچ دەستێکی تری جگە لە دەستی ئەمینی ناسپێرم!

حاڵی ڕاستەقینەی هەردوو لا، لەسەر ئەم تەرزەن کە باسمان کرد. ئەوەندە هەیە کە پلەکانی خەڵکی لە "هیدایەت و گومڕایی.. ئاگاداری و بێئاگایی"دا جیاوازن.

بەڵام "بێئاگایی" بە ڕادەیەك هەستەوەری مرۆڤی لەکارخستووە کە تەنانەت خەڵکانی شارستانێتی هەست بە ئازاردانی ئەم ئەشکەنجە بە سوێ و سەختەی گومڕایی ناکەن.

بەڵام بە زێدە زۆربوونی هەستیاریی زانستی و، بێدارکردنەوەکانی "مردن"یش، ئەم پەردەی بێئاگاییە دەدڕێت.

دەســا داخ و حەسرەت و زەرەرمەنــدی بــۆ ئەو کەســەی کە بە "بــت"ی بیانییەکان لە ڕێ ترازاوە.

ئەی ڕۆڵەکانی ئەم نیشتمانە!

ئایــا دوای ئەو هەمــوو ســتەمە نــاڕەوا و دوژمنــایەتییە ســەختەی کە لە ئەوروپاوە بینیتان، هێشتا هەر لە هەرزەییانــدا چاویــان لــێ دەکەن و، بە شــوێن پێی بیرە بەتاڵەکانیانــدا هەنگــاو دەنــێن و، بــێ ئەوەی بە خۆتــان بــزانن دەچــنە ڕیزەکانیانەوە؟!

ئێوە بەم کارەتان لە لافلێدانی میللەتپەروەریدا درۆزن دەردەچن!

چونکە شوێنکەوتنی ئەوان سووکایەتییە بە میللەتپەروەری و، گــاڵتەکردنە بە نەتەوەی خۆتان!

لە خوا داواکارم ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی بکات.

* * *

# وانەی دوازدەهەم[1]

﴿كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ (البقرة: ٢٤٩).

ئەی ئەو کەسەی کە ژمارەی کافران بە زۆر دەزانێت و، بە یەکگرتنی ئەو کافرانە لەسەر ئینکاریکردنی هەندێ "ڕاستیی ئیمان" هەڵوێستی لەق دەبێت!

**بزانە کە:**

**یەکەم:**

نرخ و گرنگی لە "چەندایەتی"دا نییە. چونکە مرۆڤ گەر نەبێت بە مرۆڤێکی ڕاستەقینە، ئەوا دەگۆڕێت بە ئاژەڵێکی شەیتان ئاسا! ئەوەتا مرۆڤ هەتا زیاتر لە هاندەرە ئاژەڵییەکاندا ڕۆبچێت، بە وێنەی ئەوانەی کە نکوولی لە ئایینەکان دەکەن، پتر لە ئاژەڵەکان ئاژەڵێتی بەدەست دەهێنێت!

جا لە کاتێکدا کەمیی ژمارەی مرۆڤ لە چاو زۆریی ژمارەی ئاژەڵدا بە چاوی خۆت دەبینیت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ بووە بە جێنشینی سەر ڕووی زەوی.

**دووهەم:**

ئینکاریکردن "نەفی"یە و، هەزار کەسیش کە نەفی بکەن بایەخی دوو کەسی چەسپێنەریان نییە.

---

(١) دانەر وانەی دوازدەهەمی بەم شێوەیەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٤٢٠-٤٢٢) داڕشتووەتەوە. لە "بریسکەی حەڤدەهەم"یشدا بە فراوانتر ناوەڕۆکەکەی هێناوە. بڕوانە: (بریسکەکان) ل: ٢٤٠-٢٤٣؛ (ڕاستییەکانی ئیمان) ل: ٨٠-٨٤. (وەرگێڕ)

ئەگەر وتت: کافر کێیە؟

پێت دەوترێت:

ئەو کافرانەی کە هیچ ئاینێکیان نییە، جۆرێکی چەپەڵن لەو ئاژەڵانەی خوای گەورە کە بۆ ئاوەدانکردنەوەی دنیا و بۆ دۆزەخ بەدیی هێناون و، کردوونی بە "یەکەی پێوانە" بۆ ناسینی پلەی ئەو نیعمەتانەی کە بە بەندە ئیماندارەکانی خۆی بەخشیون!

هیچ هێزێکیش لە یەکگرتنی ئەواندا نییە لەسەر "ئینکاری" و "نەفیکردن"ی شتێك کە "حەق" بێت، بەهۆی ئەوەی ئەو کارە "نەفی"یە، چونکە کوفر بریتییە لە نەفی و ئینکاری و نەزانی و نەبوون، هەرچەندەش لە شێوەی "چەسپاندن"دا پیشان بدرێت.

نموونەی ئەمە، وەك ئەوەی کە ئەگەر (لە سەرەتای مانگی ڕەمەزاندا) هەموو دانیشتووانی ئەستەمبووڵ "نەفی"ی بینینی مانگی یەك شەوە بکەن و بڵێن: نەماندیوە، کەچی تەنها دوو کەسی چەسپێنەر شایەتیی بینینی بدەن، ئەوا بەهۆی نهێنیی پشتگیریی "چەسپاندن" و، ڕوانینی بۆ خودی شتەکە و، ڕوانینی "نەفی"ش بۆ ئەو شتەی کە لای خودی کەسی نەفیکەر وایە، شایەتیی ئەو دوو چەسپێنەرە وەردەگیرێت و پێش دەخرێت بەسەر کۆدەنگیی هەموو نەفیکەراندا.

بۆ نموونە:

گەر هەور ڕووی ئاسمانی داپۆشی.. ئنجا لەو کاتەدا سەرمان بەرز کردەوە و، لەناو هەموو خەڵکی وڵاتدا تەنها کۆمەڵێکی کەم "خۆر"یان بینی، ئایا ئەو قسەیەت لێ وەردەگیرێت کە بڵێیت:

"نەفیکاران موتەواتیرن و، بینەرانیش کەمن، شوێنکەوتنی زۆرینە باشترە"؟

نەخێر! چونکە ئەو کەسەی خۆری نەبینیوە، بۆی هەیە بڵێت:

"لای من و لە بینینی مندا خۆر دیار نییە"..

نەك بڵێت:

"خۆر لە ڕاستیدا بە ڕووی ئاسمانەوە نییە".

بەم جۆرە و، لەبەر جیاوازیی دەعوا لەسەرکراوی نەفیکەران، لەم ڕووەوە، هیچیان بڕیاری ئەوی تر بەهێز ناکات.

کەواتە کۆدەنگیی ئەوان نرخی یەك دانەی هەیە و، بە وێنەی کۆبوونەوەی کەسانێکی زۆر وایە بۆ حەلکردنی مەسەلەیەك (کە بە زەین حەل بکرێت)، یان تێپەڕبوون بەناو کونێکی بچووکدا (کە سوود بە ئاسانکردنی بابەتەکە ناگەیەنێت و پشتگیریی تێدا دروست نابێت)..

بە پێچەوانەی چەسپێنەران کە هەموویان سەیری خودی شتە چەسپاوەکە دەکەن لە واقیعی حاڵدا، چونکە ئەوان دەعواکانیان دەبن بە یەك و، یەکدەگرن و، هێز بە یەکتری دەبەخشن، چەشنی پشتگیری یەکتر لە هەڵگرتنی بەردێکی مەزندا (کە بەرزکردنەوەی ئاسانتر دەبێت، چونکە هەریەکەیان هێز لەوانی تر وەردەگرێت)[1]!

* * *

---

(١) هەرچەندە دانەر لە دێڕەکانی پێشوودا بە پوختی ڕوونکردنەوەی لەسەر ئەم بابەتە دا، لەگەڵ ئەوەشدا با خوێنەری بەڕێز بۆ زانیاریی زیاتر سەردانی "بینینەکانی گەشتیارێك" بکات، ل: ٢١-٢٣. یاخود کتێبی (تیشکەکان) ل: ١٧١-١٧٣. (وەرگێڕ)

# وانەی سیازدەهەم[1]

﴿وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوْتِـيَ خَيْراً كثيراً﴾ (البقرة: ٢٦٩).

ئەی ئەو کەسەی دەیەوێت جیاوازیی نێوان حیکمەتی قورئان و حیکمەتی فەلسەفە بزانێت!

**بزانە کە:**

ئەم دوانە وەکو موصحەفێك وان کە پیتەکانی بە زەڕکفتی جۆراوجۆر و نەخشونیگاری ڕازاوە؛ هەندێکیان بە زێڕ و زیو، هەندێکیان بە ئەڵماس و زمڕووت، هەندێکی دیکەیان بە گەوهەر و یاقووت، نووسرابێتەوە.. هتد..

ئنجا دوو کەس سەیریان کرد و بەلایانەوە جوان بوو.. پاشان وتیان:

با هەر یەکەمان کتێبێك لەسەر لایەنە جوانەکانی ئەم شتە بنووسین..

ئیتر هەریەکەیان کتێبێکی نووسی..

**یەکەمیان:**

کەسێکی بیانی بوو؛ تەنانەت یەك پیتی لە زمانی عەرەبی نەدەزانی، بە ڕادەیەکی وا کە شارەزای ئەوە نەبوو ئەم شتەی دەیبینێت "کتێب"ە. بەڵام شارەزا و کارامە بوو لە ئەندازیاری و، وێنەگرتن و، ناسینی گەوهەرەکان و،

---

(١) دانەر وانەی سیازدەهەمی بەم شێوە پوختەی ئێرە لە "مەسنەویی نووری"دا ل: (٧٢١-٧٢٢) دارشتووەتەوە. بە جۆرێکی فراوانتریش لە "وتەی دوازدەهەم"دا ناوەرۆکەکەی هێناوە. بڕوانە: (وتەکان) ل: ١٨٧-١٩٣؛ هەروەها کتێبی (من.. خودیی مرۆڤ و بزووتنی گەردیلەکان لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا) ل: ١٠١-١١٠. (وەرگێڕ)

تایبەتکارییاندا. ئیتر کتێبێکی گەورەی نووسی تیایدا باسی لە نەخشونیگاری پیتەکان و، پەیوەندییان و، گەوهەرەکان و، تایبەتکارییان و، پێناسەیان و، بارودۆخیان، کردبوو.

**ئەوی تریان:**

کاتێ بینیی، یەکسەر زانیی کە ئەوە کتێبێکی ڕوون و قورئانی حەکیمە. ئیتر خۆی بە نەخشونیگاری پیتەکانەوە سەرقاڵ نەکرد، بەڵکو کاری لە شتێکدا ئەنجام دا کە بە ملیۆنەها جار بەرزتر و بەنرختر و ناسکتر و بەڕێزتر و ڕازاوەتر و جوانتر بوو لەوەی کە هاوەڵەکەی پێیەوە سەرقاڵ بوو، ئەویش ڕوونکردنەوەی گەوهەری واتاکانی و ڕووناکیی نهێنییەکانی بوو. ئیتر تەفسیرێکی بۆ ئەو قورئانە نووسی کە لە ڕاستیی ئایەتەکانی دەدوا.

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە ژیرییەکی هەیە!

سوێندت دەدەم بە خوای گەورە، بە کام لەم دوو کتێبە دەوترێت:

کتێبی حیکمەتی ئەم قورئانەیە؟

جا ئەگەر لە نموونەکە تێگەیشتوویت، سەیری ڕووی ڕاستی بکە:

موصحەفەکە؛ ئەم جیهانەیە..

دوو کەسەکەش؛ یەکەمیان فەلسەفە و حەکیمەکانی و، دووهەمیشیان قورئان و قوتابیانیەتی.

* * *

# پوختەیەک لە ژیانی دانەر

* ناوی "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی"یە .
* لە گوندی "نوورس"ی سەر بە پارێزگای "بەدلیس"ی کوردستانی ژێر دەستەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایك بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* "صۆفی میرزا"ی باوکی بە پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و، هەر خۆراکێك حەڵاڵ نەبووبێت دەرخواردی مناڵەکانی نەداوە.. خاتوو "نووریە"ی دایکیشی بە پاك و خاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە مناڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و، باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" نێژراون.
* چوارەم مناڵی خانەوادەکەیانە کە یەك لە دوای یەك ئەمانەن:
(دوڕڕیە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان).
* لە پێشدا لە لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە. پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و، لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* لە تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی لە زانستە ئیسلامیەکاندا بەدەست هێناوە.
* بە هەوڵ و تەقالای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەك: کیمیا، فیزیا، بیۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا، هتد.. پەیدا کردووە.
* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لە ڕادەبەدەری، نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی لە لایەن زانایانەوە پێ دراوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و، کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و، خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شان بە شانی زانستە ئاینییەکان. لەم پێناوەشدا لە لایەن دواهەمین دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕووبەڕووی چەندین گرفتی دژوار بووەتەوە.

* گەورەترین زانا و کەسایەتیی کوردی ئەم سەردەمەیە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لەناو نەتەوەی کورددا هەڵکەوتووە و، ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و، لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت.
* تاکە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبر و زەنگێکی ڕژێمی مستەفا کەمال و، سی و پێنج ساڵی بەندی و دوورخستنەوە و دەستبەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە چۆکی پێ دابدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی کۆڵی پێ بدەن. تەنانەت ئەو توانیویەتی سەرکەوتنیشیان بە سەردا بە دەست بهێنێت.
* زیاتر لە سەد و سی کتێب و نامیلکەی لە ژێر ناونیشانی (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صالحی)یەوە لە دە دانە بەرگی گەورەدا تەواو بووە و، لە وڵاتانی تورکیا و میسر و هیندستان و عەرەبستانی سعوودی چەند چاپێکی یەك لە دوای یەکیان تا ئێستا لێ بڵاوکراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن خوشکی نۆموسڵمان ماری وێڵد (شوکران واحیدە)وە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و بڵاو کراونەتەوە.
* بە (زمانی کوردی)ش (**سەرجەمی پەیامەکانی نوور**)مان لە نۆ بەرگی گەورەدا چاپ کردووە، جگە لە چل و حەوت کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.
* چەندین کتێبی تر بە زاری کرمانجیی ژووروو بڵاوکراونەتەوە.
* چەند بەشێکی ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:
(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تاڵشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەرەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرغیزی، کازاخی، کۆری، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی).
* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنفرانسی جیهانی و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیریی لە ئاستی جیهاندا لەسەر کراوە و، دەیان کتێب و، سەدان لێکۆڵینەوەی

لەسەر نووسراوە و، چەندین بەڵگەنامەی زانکۆییشی لە خوێندنی باڵادا لەسەر وەرگیراوە، کە هەندێکیان لە کوردستاندا بووە.
* لە وڵاتی هیندستان پەیمانگایەکی تایبەت بە ناساندنی مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی دامەزراوە، کە خوێندن تیایدا بەردەوامە.
* دواهەمین گەورە کۆنفرانسی زانستیی جیهانی لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە شاری ئەستەمبووڵ لە بەرواری (١-٣/١٠/٢٠١٧ز)دا بەڕێوەچوو، کە زیاتر لە سەد توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا و، چەند توێژەرێکی باشووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستاندا، هەتا ئێستا سێ سیمینار ساز کراوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* هەروەها کۆڕبەندێك لە بەرواری (٢١/١٢/٢٠١٣ز) لە شاری هەولێر لە لایەن پەیمانگای زانستە ئیسلامییەکان و وەزارەتی ئەوقافی هەرێمی کوردستانەوە ڕێکخرا بە بەشداریی چەند توێژەرێکی ناوخۆی کوردستان و وڵاتی تورکیا و، بە ئامادەبوونی دەیان کەسایەتیی زانستی و ئایینیی عێراق و هەرێم.
* هەروەها لە بەرواری (١٢/١٢/٢٠١٥ز)دا لە شاری هەولێر نەدوەیەکی زانستی لە لایەن (ڕێکخراوی پەیامی پاك)ەوە بۆ مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی ساز کرا بە ناوی "نووری نبووەت لە پەیامەکانی نووردا" کە چەند توێژەرێکی باکووری کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە بەرواری (٢٦/٣/٢٠١٦ز)شدا لە شاری هەولێر لە لایەن (ئەمینداریتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) و بە بەشداریی سەنتەری ڕۆشنبیریی (وقف الخيرات) نەدوەیەکی ڕۆشنبیری بە ناوی (الإمام بديع الزمان سعيد النورسي ومنهجه في إحياء الإيمان) بەڕێوەچوو چەند باس و بابەتێکی بە زمانی عەرەبی تێدا پێشکەش کرا.
* دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم لە شاری سلێمانی لە ساڵی (٢٠١٦)دا ژمارە (٨٩)ی بڵاوکراوەی (ڕۆڤار)ی تایبەت کرد بە مامۆستا نوورسی بە ناوی (سەعید نوورسی.. کلیلی گەنجینەیەکی شاراوە).
* هەتا ئێستا لە باشووری کوردستاندا شەش مزگەوت بە ناویەوە ناونراوە لە شارەکانی (سلێمانی، سۆران، کەرکووك، هەولێر، پێنجوێن، هەڵەبجە).

# پێرستی بابەتەکان

**بابەت** — **لاپەڕە**



* * *

# یەکەم دەروازەی نوور

❁ ئیماندارانی پێشەنگ لە گەشتی یەکلاکردنەوەی "بەندەیی"یاندا بۆ بەدیهێنەر، بە چەندین موعاناتدا تێدەپەڕن، تا ئەو کاتەی پەردەکان لادەدەن و بینایی دڵیان بەسەر دیمەنی ڕاستییە مەزنەکاندا واڵا دەکەن.

❁ ئەم پەیامەش، لەم ڕووەوە، چەند وانەیەکە لە یەکەمین هەنگاوەکانی دانەر لە دەمی بڕینی قۆناغی "سەعیدی کۆن"دا بەرەو "سەعیدی نوێ". لە هەمان کاتیشدا هەوێن و نۆبەرەی "پەیامەکانی نوور" دەنوێنێت.

## الْمَدْخَلُ إلىٰ النُّورِ

من كليات رسائل النور

التي ألفها الأستاذ:

بديع الزمان سعيد النورسي

(رحمه الله)

## First Door of the Divine Light

From

The Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi


0-0267-0000-X
9 780026 700009

نرخی (١٠٠٠) دیناره